ناوی کتێب: خەندەی خەبات

نووسەر: ڕەهبەر سەید برایم

بابەت: نوکتە و قسەی خۆش

تایپ: باوان محەمەد

نەخشەسازی: هەرێم عوسمان

چاپ: چاپخانەی تاران

تیراژ: ١٠٠٠

نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم

ساڵی چاپ: ٢٠٢١ - سلێمانی

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٨٢٥)ی ساڵی٢٠١٩ی پێدراوە

ناو نیشان : سلیمانی ـ بەردەرکی سەرا ـ تەنیشت ئوتێل مەولەوی

کۆشکی سەرا

کۆشکی سەرا

0750 159 3939

## بەرچاورِوونی:

ئـەو راژۆیـانـە° وتـەی بـەتـام ونـەسـتـەق وڕاسـتـی ڕووداو وبەسەرهاتن، هەڵقوڵاوی ناو گریان وئاگردانی شۆڕش وڕۆژانی سەخت وسەنگەری خەباتن، مەبەست لێیان هەڵکشان وشکاندن نییە بەنیەتی سووکایەتی، بەڵکو دەرخستنیانە وەک سامانێکی نەتەوایەتی وکوردایەتی، چونکە خەندە دەبێتە مەشخەڵی ڕووناکی مرۆڤایەتی، پیاوێک گریا تا دونیا پێ بکەنێت، (چارلی چاپلین) توانی داری غەم هەڵبکەنێت، کەسی بە دۆزەخ نەدەترساند وبەڵێنی بەهەشتی نـەدەدا بەکەس، پەیامبەری شادومانی وپێکەنین بوو بەس، بەجووڵە وگۆچان شەپقە، یەک قسەی نەکرد ونەیکرد نەقە!. ئەو گوتی گەورەترین وگرنگترین شانازی بەندە، گۆڕینی گریانی خەڵکە بۆ پێکەنین وخەندە!.

ئەو قسە خۆشانە بۆ خەندە وخۆشی گشتیین، گوڵی شاخی ودەشتی وسروشتین، بەهاراتی پێوەکراوە وترش وخوێ کراون، بـەڵام وەک خۆیانن لەگەوهەر وجـەوهـەر نـەگـۆڕدراون، گوڵە نێرگزی ناو شەختە وسەختی زستانن، شەمامەی بەتامەی ناو ڕەز وبیستانن، لەچەقەن وڕەقـەن وناوتەقە ونـاو بەفر ڕواون، بەفرمێسک وخوێن وئارەقە ئاودراون، مێژویەکی گەشە بە ئاورێ، خەندە دژمن دەکاتە هاورێ، ڕووی مرۆڤی پێ گەش دەبێتەوە، ئازارەکانی دەروون دەسڕێتەوە، وەک دەڵێن پێکەنین خەرجی نییە سوودی فراوانی هەیە، بۆ هەست کردن بۆ خۆشبەختی وئارامی ڕۆح وخەندەی لێوانی هەیە، هەموو مرۆڤەکان پێ دەکەنن بەیەک زمان ولێو، ئەو قسانە لەسەر زاران دەبنە شەکرەسێو، یەک خەندە بەسە، کورتترین مـاوەی دوو کەسە، خەندەی خەبات وشنەی

شاخ هەر ئەوەندەنین، زۆر ماون وباسنەکراون وشاراوەن لەکن بەندەنین، گەر هەندێ وشە نەشیاو وهێلی سوورن، بە گەورەیی حەزرەتی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لێمان ببوورن.

دەبێت سوپاسی ئەو زاتە بەڕێزانە خاوەن تەنز وئازیزانە بکەین هاوکارمان بوون زۆر کات، بۆ (خەندەی خەبات)، بۆیە ئەو کتێبە پێکهات:

١. کاکە حەمەی حاجی مەحمود
٢.م.جەعفەر(فازیل کەریم ئەحمەد)
٣.ئاریز عەبدوڵڵا
٤. شێخ چاپوک سەید عومەر
٥. دلاوەر ئەحمەد مەجید
٦. مەلا ئاریان محەمەد
٧. هەڵۆ حەسەن
٨. جەمال سالح خۆشناو
٩. سامی قادر
١٠.باوان محەمەد صدیق
١١.سەرمەد سەلاح سابیر
١٢.ڕازاوە ڕەزا
١٣.ئیسماعیل ڕەسول
١٤.هەرێم عوسمان
١٥.پەیوەند هۆشیار
١٦. سەروەر پێنجوێنی

رەهبەر سەید برایم
٢٠١٩/١٠/٣

* ڕاژۆ:واتە نوکتە

# پێشەکی



فەرید ئەسەسەرد

ئەو چیرۆکە زیندووانەی لە دوتوێی ئەم کتێبە کۆکراونەتەوە، بەشێکن لە وێـژەی سـەرزارەکـی کـە وێـژەیـەکـە دەمـاودەم دەگوێزرێتەوەو رەنگدانەوەی ژینگەیەکی سیاسی- کۆمەلایەتی- کەلتوریی قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراوە. بەم واتایە، وێژەی سەرزارەکی گوزارشت لە کەلتورو داب و نەریتە دێرینەکان دەکات. ئەو چیرۆکانە بەشێکن لە مێژویەکی تۆمارنەکراو و چەند زوو تۆمار بکرێن ئەوەندە باشتر پارێزگاری لە رەسەنیی خۆیان دەکەن. کات بۆ پاراستنی وێژەی سەرزارەکی بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. هەرچەند نەوەکان وێژەی سەرزارەکییان نەوە دوای نەوە پاراستووە، بەلام هیچ گەرەنتییەک نیە کە گێرانەوەکان دەقاودەق بگوێزرێنەوەو گۆڕانیان بەسەردا نەیەت. بۆیە چەند زوو تۆمار

بکرێن، ئەوەندە لە گێڕانەوەدا زمانیان وردترو راستگۆتر دەبێ و بەشێوەیەکی تەباتر لەگەڵ سەردەمی روودانی بەسەرهاتەکان گوزارشتیان لێ دەکرێ. ئەو چیرۆکانەی کە کاک رەهبەر سەید برایم لە دوتوێی ئەم کتێبە کۆی کردونەتەوە، پەیوەستن بە سەردەمێکی دیاریکراو کە سەردەمی پێشمەرگایەتییە. ئەمە بەم واتایە دێت کە ماوەی مێژوویی چیرۆکەکان کەوتۆتە نێوان ١٩٧٦-١٩٩١. ئەو کێشانەی کە دێنە بەر رێی هەر هەوڵێک بۆ پاراستنی وێژەی سەرزارەکی، بە دڵنیاییەوە هاتونەتە بەر رێی کاک رەهبەریش. کۆکردنەوەی ئەم وێژەیە کارێکی قورسە، چونکە تاکە سەرچاوەی چیرۆکەکانی ئەو سەردەمە، ئەو کەسانەن کە بەسەر دوو ئاستدا دابەش دەکرێن. ئاستی یەکەم، کە لوتکەی متمانەیە، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە رووداوەکانی چیرۆکەکان بەسەر خۆیاندا هاتووە یان بە چاوی خۆیان دیویانە، بۆیە گێڕانەوەکانیان هیچ جۆرە گومانێک هەڵناگرن. ئاستی دووەم ئەوانەن کە لە کەسی ترەوە رووداوەکانیان بیستوەو هەوڵ دەدەن وەکو خۆی، بێلایەیانە، بیانگێڕنەوە. ئەم ئاستە لە وردیدا ناگاتە وردیی ئاستی یەکەم و لە وردەکاریی گێڕانەوەدا رەنگە توشی لەبیرچونەوەو تێکەڵ و پێکەڵ کردن ببێت. بەڵام ئەم کەموکوڕییە ناگاتە ئەو رادەیەی کە نەتوانین پشت بە گێڕانەوەکانیان ببەستین. پرۆسەی کۆکردنەوەی چیرۆکەکان خۆی لە خۆیدا پرۆسەیەکی ئاڵۆزەو لەم سەروبەندەدا گرنگترین هەنگاو تێیدا دۆزینەوەی

سەرچاوەکانە، ئینجا بیستنی گێڕانەوەکان لێیان. ئەو چیرۆکانەی لەم کتێبە کۆکراونەتەوە، ئەوەندەی لە توانادا بوو بێ، بە دیکۆمێنتکراوی تۆمار کراون. واتە ناوی پاڵەوانەکانی چیرۆکە کۆکراوەکانیان تێدا هاتووەو ناوی شوێنی بەسەرهاتەکانیش دیاری کراون و هەندێ وردەکاریی دیکەشیان لە ناواخندا نمایش کراوە. بەڵام لە زۆربەیاندا کات لەبەرچاو نەگیراوە، بۆیە لە زۆربەیاندا ساڵی بەسەرهاتەکان دیاری نەکراوە، بەڵام ئەمە کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر گێڕانەوەکان نەبوە، بە رەچاوکردنی ئەوەی کە هەندێ لەچیرۆکەکان کە پەیوەستن بە روداوێکی دیاریکراو، لە تەکنیکی گێڕانەوەدا ئاماژەیان بە هەندێ وردەکاری کردوە. ئەمەش دەرفەتێکی وا دەڕەخسێنێ کە ساڵی روداوەکەش دیاری بکرێ، ئەویش ئەگەر پێویستی کرد. لەم کتێبەدا بەسەرهاتەکان لە زارەوە گوێزراونەتەوە سەر کاغەزو لەم پرۆسەیەدا وێژە تۆمارکراوەکان ترسی فەوتانیان لەسەر نەماوە. چیرۆکەکانی ناو ئەم کتێبە گوزارشت لە سەردەمێک دەکەن کە لە میمۆریی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا رێزو سەنگێکی تایبەتی هەیەو رەنگدانەوەی بەهاو نەریتە جوانەکانە. لە راستیشدا ئەو چیرۆکانە رەهەندێکی سۆسیۆلۆژی- سایکۆلۆژییان هەیە چونکە دەمانگێڕنەوە بۆ سەردەمی رابردوو و ئەو دەرفەتەمان بۆ دەڕەخسێنن کە تێیدا بژین، میتۆدی بیرکردنەوەو لێکدانەوەی خەڵکی ئەو زەمانەو حەزو ئاوات و گرفتەکانیان تێ بگەین، ژیانی

رۆژانەیان بەسەر بکەینەوە، داب و نەریت و کەلتوریان تێ بگەین، گوێمان لە وشەکانیان و شێوەی ئاخافتنیان ببێ، تێڕوانینیان بۆ ژیان و ئایندە بزانین، پەی بە گوزەران و شێوەی ژیانیان ببەین و تەنانەت خەونەکانیشیان بزانین. هەر بۆیە ئەم کتێبەو هەموو کتێبە هاوشێوەکانی، میکانیزمێک بۆ کات بەسەر بردن لە رابردوو و لە نزیکەوە تێگەیشتنی رابردوو، دابین دەکەن. لێرەدا خوێنەر خۆی دادوەرە. کەس هیچی بۆ شرۆڤە ناکاو هیچی بۆ لێک ناداتەوە. خۆی چیروکەکان دەخوێنێتەوەو پەندیان لێ وەردەگرێ و تێڕوانینێک بۆ سەردەمەکە لە مێشکی خۆی دروست دەکا. لە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکانەدا، کەس رێنمایی کەس ناکا. تەنانەت کۆکەرەوەی چیرۆکەکانیش پاش ئەوەی کە چیرۆکەکان دەخاتە بەردەم خوێنەرەوە، رۆڵی کۆتایی دێت و مەسەلەی وەرگرتنی پەندو لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی چیرۆکەکان بۆ خودی خوێنەر دەهێڵێتەوە. ئەم کتێبە میکانیزمێک بۆ پاراستنی میراتی کەلتوری رابردوو پێشکەش دەکا. بە پێچەوانەی توێژینەوە ئەکادیمییەکانەوە، سەرچاوەکانی کەرەستە کۆکراوەکانی ناو ئەم کتێبە نوسراو نین، سەرزارەکین و پشت ئەستوریشن بە یەک تاکە شێواز ئەویش کۆکردنەوەیە. لە کۆکردنەوەی کەرەستە دەماودەمییەکاندا پشت بە گۆشینی میمۆریی خەڵک دەبەسترێ. لەو روانگەیەشەوە کە میمۆری هەمیشە پەیوەندیی بە رابردووەوە هەیە، ئەم کتێبە ناتوانێ خۆی لەوە راپسکێنێ کە مامەڵە لەگەڵ

رابردودا دەکا. بەڵام جیاوازیی لە توێژینەوە ئەکادیمییەکان لەوە دایە کە بابەتە نمایشکراوەکان وەک کەرەستەیەکی خاو تێیدا پیشکەش دەکرێن و پەند وەرگرتن و لێکدانەوەو شرۆڤەو چێژ لێ وەرگرتنیش بۆ خوێنەر دەهێڵدرێتەوە. بۆیە دور نیە تەواوی پرۆسەکە لە بەرەنجامی کۆتاییدا بەو سەرەنجامە بگات کە کەرەستە کۆکراوەکان ببن بە فۆلکلۆر. ئەگەر پرۆسەکە بەو سەرەنجامەش نەگات، بە دڵنیاییەوە تا ئەو شوێنە بڕ دەکا کە تێیدا کەرەستەکان ببنە مایەی تۆکمەکردنی کەلتورو ناسنامەی نەتەوەیی و لەم سەروبەندەدا دەشێ هەندێ داب و نەریتیان لێ بکەوێتەوە کە پەیوەندیی تاک و کۆمەڵگایان پێ ڕێک بخرێ. هەموو ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە چێژێکی زۆری لێ وەردەگرن. بەڵام کەس نازانێ کۆکەرەوەی کەرەستە سەرزارەکییەکان چەند ماندوو بووە و چەند ئەرکی کێشاوە. بۆیە کاک ڕەهبەر لەم کارەیدا شایستەی ئەوەیە دەستخۆشیی لێ بکرێ.

## هێلکەی کوڵاو!

١. پێشمەرگەیەک هەبوو، زۆر زیادەڕەوی دەکرد، لە خۆیەوە پێوەی دەنا ناوی (ف. سەرەگا) بوو ساڵی ١٩٨٥، جارێک لەلای لێپرسراوەکەی گوتبووی! بڕوا دەکەن مریشکێکم هەبوو ئێواران ئاوی گەرمم دەدایە، بەیانییان هێلکەی کوڵاوی بۆ دەکردم، لێپرسراوەکەش سەر دەلەقێنێ و سەری دەسوڕمێ دەڵێ: ئەمجارە ڕۆنی بدەیە بەڵکو هێلکە ورۆنت بداتێ!

## با فڕۆکەی تورکی بمکوژێ

٢. لە شەڕی براکوژی ساڵی ١٩٩٧، فڕۆکەی تورکی هێزەکانی (ی.ن.ک) دەکوتاو بۆردومانی دەکرد، ئارێز عەبدوڵلا وعەبدوڵلا بۆر فەرماندە بوون فەرماندەیی شەڕیان دەکرد لە بەنی هەریر، مامۆ سەرانەیی فەرماندە بوو نێوانی لەگەڵ عەبدوڵلا بۆر خۆش نەبوو، لەوکاتەی فڕۆکەی تورکیا بۆردومانی دەکرد، مامۆ سەرانەیی لەسەر بەردێک بوو نەدەجوڵا وخۆی حەشار نەدەدا، تۆپیش دەباری ئارێز عەبدوڵلا چەندان جار پێی دەڵێ خۆت لەپەنا بەردێک مات بکە با فڕۆکەکەی تورکیا نەتکوژێت، مامۆسەرانەیی گوێی پێ نەداو تەقەی سەری دێت، ئارێز عەبدوڵلا بەخۆ لێ تورەکردنەوە بانگ دەکات دەڵێت ئێستا مانای هەیە وادەکەی، فڕۆکەکە دەتکوژێ مامۆسەرانەیش دەڵێ: با فڕۆکەی تورکی بمکوژێ نەک لە خەفەتی عەبدوڵلا بۆر بمرم!!

## دوو خوا لە ئاسمان هەبا ئەستێرەکان بەشەڕ دەهاتن

٣. لەسەرەتای شۆرشی نوێی گەلەکەمان بەسەرکردایەتی (ی.ن.ک) بەشانازییەوە دەچوونە ناوخەڵک دەیانگووت ئەمجارە جیاوازە سێ باڵە ئەوسا (ی.ن.ک) کۆمەڵە وبزوتنەوە وخەتی گشتی بوو، مانای پێکەوە ژیان وململانێ لەسەر بنچینەی برایەتی ویەگرتوویی، سەعدی گچکە وقادر عزیز، لە ماڵی کوێخا عەزیزی سەروچاوە دەڵین لەدۆلی سماقووڵی ئەو قسانە دەکەن کە (ی.ن.ک) سێ تیارە وسێ بەشە بەبرایەتی ویەکگرتوویی شۆڕش وخەباتی چەکداری دەکەین وبەوشێوازە بەئاواتەکانی کورد دەگەین، کوێخا عەزیزیش بە ئەزموون وحاکمی شۆڕشی ئەیلوول بووە دەڵێ: عەقڵم نایگرێ هەریەک حزب باشە، بەخوای سەرەنجام بەشەڕ دێن ویەکتر دەکوژن ولێک دەدەن، بەو خوایە دوو خوا لەو ئاسمانەی هەبا ئەستێرەکان بەشەڕ دەهاتن!

## ددانی تاخم ..

٤. پایزی ساڵی ١٩٨٠، مامۆستا( محەمەدی عەتیە) و هەڤاڵ (س) لە (خڕێ نێرزەنگ)ەوە دەنێردرێن بۆ دیوی ئێران، لە بۆکان هەندێ ئازوقە بکڕن وبگەڕێنەوە، بەڵام کە پێویستیەکان دەکڕن ودەینێرنەوە خۆیان لەبۆکان دەمێننەوە دەچن خۆیان دەشۆن وخۆیان قیت وقۆز دەکەن کە دەچن پێویستییەکان دەکڕن،

دەینێرنەوە، لەو شاخ وچۆلیەی خڕی نێرەزەنگ لە شاری بۆکانن، دەچن خۆیان دەشۆن و خۆیان قیت وقۆز دەکەن وساف ولوس وخاوێن، لەوێش دەچنە بەردەم قوتابخانەی کچان، بەڵکو نازداری، شۆخێ، کچی جوان ببینن، مامۆستا( محەمەد عەتیە) ش خۆی سوعبەتچی و قسە خۆش بوو، هەمیشە گاڵتەی دەکرد، قسەی خۆشی دەگێڕایەوە، لەوکاتە خوێندکارە کچەکان بەردەبن و ئەمانیش بەڵکو چاوێ، بزەیە، دڵیان خۆش بێ، بە نیگایەکی عاشقانە، مامۆستا (محەمەد عەتیە) قسەی خۆشی بۆ هەڤاڵ (س) دەگێڕێتەوە و هەڤاڵ (س)یش هێندە پێ دەکەنێ، لەگەڵ پرمەی پێکەنین و پژمیندا هەڤاڵ (س) تاخمە ددانەکەی لە دەم دەردەپەڕێ دەکەوێتە بەردەمی کچەکان و مامۆستا (محەمەد عەتیە)ش نەیزانی هەڤاڵ (س) ددانی تاخمە، ڕێک فەشەل دەهێنن، کچەکان پێیان پێ دەکەنن! تەریق دەبنەوە.

## دای پۆشە .. با کەس نەزانێ !

٥. مامۆستا (ڕەفیق عەبدوڵلا صەبری) ناسراو بە مامۆستا ئەنوەر لێپرسراوی ڕێکخستن بوو لە بەری قەرەداخ، لە گوندێکی قەرەداخ خۆی حەشار دەدات، بۆ ئەوەی پشوو بدات، تاوێ بە هێمنی و بە تەنیایی کات بباتە سەر لە ساڵی ١٩٨١، کۆمەڵێ پێشمەرگەی تیپی (٥٥)ی قەرەداخ لێی دەگەڕێن، دەچنە ئەو گوندەی مامۆستا ئەنوەر خۆی لێ حەشار داوە، ئەویش بە

خاوەن ماڵ وخەڵکی گوندەکەی گووتووە، باس مەکەن ومەڵێن لەو گوندەیە، ئیتر پێشمەرگەکان دەگەڕێن ودەپرسن، سۆراخی نازانن و بێ ئومێد دەبن، دەیانەوێ گوندەکە بەجێ بهێڵن چونکە مامۆستا ئەنوەریان نە دۆزیوەتەوە، دۆڵاودۆڵ و لاڕێ دەڕۆنەوە، لە نزیک گوندەکە یەک لە هاوڕێکانی شەڵتەیەک پیسایی دەبینێ، تەڕ وتازە و گەورە و ئەستور، هەڵمی لێ هەڵدەستێ، ڕێک هاوار دەکات مامۆستا ئەنوەر لەو ناوەیە و لەو گوندەیە، بە پیساییەکەی دەی دۆزنەوە، مامۆستا ئەنوەر دەڵێ چۆنتان دۆزیمەوە، هاوڕێیەکەشی دەڵێ بە پیساییەکەت، چونکە پیسایی ئەو لە هی کەس نەدەچوو، گەورەو ئەستور، لە شێوەی نەبووە، بۆیە دەڵێن گەر جارێکی دیکە خۆت شاردەوە، پیساییشت کرد، دای پۆشە و خۆڵ بکە بانی با کەس نەزانێ!

## بزانم وایە!

٦. عەبدوڵڵا، هاولاتییەکی گوندی (خاڵە بازیانی) بوو کیسەڵێکی بەخێودەکرد و قەڵەوی کردبوو لە ساڵی ١٩٨٣، پ.م سەمەد گلی لە تیپی ٥١ی گەرمیان دەیبینێ، و سەیری پێ دێت، بۆیە لێی دەپرسێ (مام عەبدوڵڵا) ئەو کیسەڵە بۆ بەخێودەکەی، هۆکاری چییە؟ (مام عەبدوڵڵا)ش دەڵێ: دەڵێن کیسەڵ دوو سەد ساڵ، دەژی بزانم وایە! وایدەزانی تەمەنی لەگەڵ کیسەڵ هاوتا دەبێ!! مرۆڤ چییە، بە قەد کیسەڵێک ناژی!.

## قاله دێگەڵی مالوومە!

٧. (دەروێش قادر مالوومەیی) بە (دێگەڵ) توورە دەبوو، لە ڕادەبەدەر مام جەلالی خۆش دەویست، قالە دێگەڵ کەسایەتی و کوردپەروەر و تێکۆشەر بوو!، دۆستی نزیکی باڵی مەکتەبی سیاسی و باڵی جەلالییەکان بوو، قالە دێگەڵ بە چەند شتێک توورە دەبوو، وەکو بانەڵە، دێگەڵ، کێشامەوە، میاو، مام جەلال کەچەڵە، عومەر دەبابە عەرەبی نازانێ، بەو وشە ودەستەواژانە زۆر توورە دەبوو وجنێوی دەدا، جارێک کوێخا شەریف بۆڵقامیش بە مەبەست دەڵێ: پشتی گوندی (دێگەڵە)، هێندە سەختە ئەگەر سەنگەر لێ دەی دەتوانی شەڕ لەگەڵ یەک فەوجە عەسکەر بکەیت، قالە دێگەڵیش ئیمانی نامێنێ ڕاست گوتبووی: کوێخا شەریف گەر لە پشت قوزی دایکت سەنگەر لێدەی، دەتوانی شەڕ لەگەڵ فەوجەک عەسکەر بکەیت، جارێکی دیکە (نوری ئەحمەد تەها) پێی دەڵێ (دەروێش قادر) بۆ بەناوی (بانەڵە) تورە دەبی، قالە دێگەڵیش دەڵێ: مامۆستا بۆ دایکت بگێم تورە دەبی، (نوری ئەحمەد تەها) وای دەزانی جنێوی پێ نادا، جارێک لێپرسراوێکی (ی.ن.ک) لە مالوومە، لە ماڵی خۆیان دەڵێ: توخوا مام قادر قەت پێم گوتووی (قالە دێگەڵ)؟ قالە دێگەڵیش دەڵێ: توخوا من قەت بە تۆم گوتووە دایکت دەگێم؟، جارێک مام جەلال ومەلا ناسح پێکەوە دەبن، قالە دێگەڵیش لەوێ بووە، مام جەلال بۆ بەزمان دەڵێ ئەرێ مامۆستا نێوان هەولێر وکۆیە جێیەک هەیە بیرم

چۆتەوە، مەلا ناسحیش دەڵێ: سەلامەت بی خۆت خەڵکی ئەو ناوەی ئەوە دێگەڵەیە، قالە دێگەڵیش دەڵێ دەی داکت بگێم مەلا ناسیح دەڵێ ئەوە چ بوو، مام جەلال پێ دەکەنێ! بت گووتبا مام جەلال کەچەڵە، ( قالە دێگەڵ) دەیگووت سەری مام جەلال بە قوزی دایکت، بت گووتبا عومەر دەبابە عەرەبی نازانێ، ئەو دەیگووت نازانێ دایکت بگێ!! لەسەر هەمان ڕستە و ڕیتم و دەنگ وەڵامی دەدایەوە، بت گوتبا (دێ) ئەو دەیگوت (دا) تەواوت کرد، بتگوتبا دیگەڵ ئەو دەیگوت دایکت دەگێم، جا تووڕەیان دەکرد، لەسەر یەک بە خێرایی (دێ) یان دەگوت دێگەڵ، دێگەڵ، دێگەڵ، ئەویش دەیگوت داکتان دەگێم، داکتان دەگێم.

## دەزگیرانێکی مەزن!

٨ ساڵی ١٩٨٣، لە بۆسەیەکی پێشمەرگانەدا، بە فەرماندەیی مامە ڕیشە وسەربازێک بەناوی (خالد) کە لە قوات خاسەی قواتی(محەمەد قاسم) بوو، پێشتر کێوماڵ و پەلاماری پێشمەرگەیان دابوو، لە نزیک سەرجادەی (تەکیە) دەیگرن، سەعات وجل وئەلقە ونەختێ زێڕی پێ بوو، (مامە ڕیشە) و(مەلا ئەحمەدی نسکەرە) دەیانەوێ بیکوژن، سەربازەکە هەست پێ دەکا ودەڵێ چووم بۆ سلێمانی، دیاری و جلکی بوکێ و زێڕم بۆ دەزگیرانەکەم کڕیوە، بۆ مانگی هەنگوینی وزەماوەندی گواستنەوە، سەرنجیان ڕادەکێشێ، بۆیە مامە ڕیشە دڵی پێ دەسوتێ، نەک نایکوژن،

ئازادی دەکەن ومامە ڕیشە دەڵێ: بە دەزگیرانەکەت بڵێ رجل حدیدی لەبەر خاتری تۆ نەیکوشتم، سەربازەکە خەنی دەبێ و دڵی خۆش دەبێ: دەڵێ نەمزانی دەزگیرانەکەم لە صدام حسین گرینگتر و گەورەترە، دەزگیرانەکەم هێندەی دی لا خۆشەویستر بوو، شەرت بێ مندالم ببێ ناوی کوردی لێ بنێم!

## قاسم و قائیمە!

٩. مامە ڕیشە و هەڤالانی لە چالاکییەکی سەرکەوتوودا، لە (لەیلان) پەلاماری فەوجە عەسکەرێک دەدەن ساڵی ١٩٨٢، فەوجەکە دەگرن، دیل و دەستکەوتیان زۆر بوو، مامە ڕیشە بە ئەفسەرێکیان دەڵێ: بە قائیمەیەک ناوی سەربازەکان بنووسە، ئەویش بە یەک لیست و بە زنجیرە ناویان دەنووسێ دوایی دەیان هێنێتە ناوچە ڕزگارکراوەکان، یەکێ لە پێشمەرگەکانی کەرتی چواری جەباری دەیەوێ ناوی دیلەکان بخوێنێتەوە، سەرژمێریان بکات، چەندی هاوار دەکات (قاسم باسم جنود) کەس جواب نەداتەوە چونکە تومەز نوسراوە(قائمة بأسماء الجنود) مەزانە قاسم بە قائیم تێگەیشتبوو ببوە پێکەنین زانیان هەڵەی کردووە وبەهەڵە خوێندبوییەوە.

## وامزانی سەرۆک جاشی!

١٠. لە کەرتی سێی هەمەوەندی تیپی ٥٧ی سەگرمە، کادرێک بەناوی مامۆستا (ص.ع.غ) لە گوندی (زەنان)ی بناری هەمەوەند، دەچێتە ماڵی ناسیاوێک، ماڵەکە دەبینن جلوبەرگی ئارەقاویە و خاوێن نییە، بۆیە داوای لێ دەکەن جلوبەرگەکەی بۆ بشۆن وخۆشی خۆی بشوات، جلکوبەرگی بۆ دەشۆن وخۆشی دەشوات، جلک و بەرگەکەی تەڕ بوو، وشک نەببۆوە، فەرماندەکەیان گووتبووی دەبێ بڕۆین، مامۆستا (ص.ع.غ) گوتی جلوبەرگم تەڕە وشک نەبۆتەوە، دەچن بۆ کوێ، منیش دوایی دێم بۆ ئەوێ، وا ڕێک کەوتن پاش وشک بونەوەی جلکەکانی بچنە گوندی (قولەبۆ)، ماڵی (حاجی ئەحمەد) ی بڕیار و بەڵێنیان وابوو، ئیتر مامۆستا (ص.ع.غ) پاش وشک بونەوەی جلکەکانی دەچێتە گوندەکە و ماڵی کابرای دەست نیشان کراو، کچێک لەبەر دەرگا دەبێت، دەپرسێت پێشمەرگەکان لەوێن، کچەکە دەڵێت نەوەڵڵا لێرە نین، مامۆستا دەڵێ خۆیان گوتیان لەو گوندە و لەو ماڵەین، چۆن لەوێ نین وا قسەمان کردووە لێرە بن، ئەویش دەزانێ پێشمەرگەیە، دەڵێ بەڵێ لێرەن، بەڵام ماڵت بە قوڕ نەگیرێ هێند خاوێن و پاکی، وامزانی قالە فەرەجی سەرۆک جاشی!، چوزانم پێشمەرگەی، پێشمەرگەی وا خاوێنم نەدیوە!

## ئاخ بۆ نێرەکەر!

١١. مام ڕەمەزان خەڵکی گوندی تالاوی شارۆچکەی نەوجول بوو، هەژار ونەدار وبێ دەرامەت بوو، لە داری دونیادا نێرەکەرێکی هەبوو، بۆ لە هێرشێکی دوژمندا نێرەکەرەکەی بریندار نابێ و قاچ و سمتی نێرەکەر دەشکێ! مام ڕەمەزان زۆر نیگەران دەبێ دەچێتە سەر نێرەکەرەکە دەڵێت لە جیاتی قاچی تۆ، بریا چوار هارب بکوژرایە، چوار پێشمەرگە بریندار بوایە، چوار هاوڵاتی ئەنفال بکرایە!، نەک تۆ! هەی کەرێکم بوو چ پەیکەر تەیکەری هەوراز و لێژ.

## نۆرەی باوکتانە!

١٢. شەهید (مەلا ئەحمەدی گەرمیان) فەرماندەی (٥٠)ی قەرەداخ بوو، لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگە دابەش دەبێت لە ساڵی ١٩٨٤، خاوەن ماڵ لەوێ نابێ، ژن و کوڕەکانی لەماڵ دەبن،کەڵەشێرێکیان بۆ سەڕ دەبڕن!، خاوەن ماڵ کەوتۆتە ناو سالان، دێتەوە و بەخێرهاتنی گەرمیان دەکات، بە کوڕەکان دەڵێت دە بزانم چیتان بۆ ئەو مێوانە ئازیزانە ئامادە کردووە، کوڕەکەی دەڵێ وەڵڵا باوکە کەڵەشێرێکمان بۆ سەر بڕیون، چونکە دایکم گوتی ئەو کەڵەشێرە بە مریشکەکان دانافسێ، (ناتسێتە) سەر مریشکەکان، باوکی کوڕەکە بە خۆشی پێکەنینەوە گوتی کەڵەشێرەکەتان لەبەر نەتسین بەسەر مریشکەکان سەر بڕیوە، کەوابێ چەقۆ تیژکەن، جوان ئامادەی بکەن سبەی نۆرەی باوکتانە سەری ببڕن!!

## دوەک حەبی پاراسیتۆڵ!

١٣. (خەباتە بچکۆل) پێشمەرگەیەکی گورج و گۆل و چوست وچالاک و بە ڕاپەڕ بوو، سەردەمێک نامەی لە خوارێ بۆ سەرێ دەهێنا و دەبرد، تەتەر بوو، بە جەستە ورد و گچکۆکە بوو، بۆیە پێیان دەگوت خەباتە بچکۆل، لە ڕاستی خۆی ناوی (ڕەمەزان محەمەد ساڵح کەریم) بوو خەڵکی بۆگدی دەشتی کویە و دەم زێ بوو، بەڵام پێشمەرگایەتی و خەباتی هەر لەبەری کەرکوک بوو، لە تەکیەی جەباری بوو، ساڵی ١٩٨٦ دەیەوێ بچێتە گوندی (قەرە حەسەن) لە ڕێگا تووشی گەڵابەیەک دەبێت وبەتەنیا دەبێت، گەڵابەکە ڕادەگرێت وشوفێرەکە نایەوێ سواری کات، بۆیە خەباتە بچکۆل دەڵێ گەر سوارم نەکەیت زەرەر دەکەیت، شوفێرەکەش پێی سەیر دەبێت ئەو بچکۆلە هەڕەشەی وا بکات بۆیە پێی دەڵێت: تۆ چیت بە خوای جوانە، لەبەر خاتری مام جەلال و شۆڕش و پێشمەرگایەتی نەبێت وەک حەبی پاراسیتۆڵ قوتت دەدەم و ئاویشی لەگەڵ ناخۆمەوە.

## ئحم ئحم!

١٤. ساڵی ١٩٨٣ سەرگەلوو زۆر قەرەباڵغ بوو پڕبوو لە پێشمەرگە، بارەگا و ماڵەکان پێشمەرگەیان تێدا بوو، تەنانەت لە مزگەوتی سەرگەلوو سەرئاو ودەست بەئاوگەیاندن زەحمەت بوو، بە نۆرە بوو، جارێک پێشمەرگەیەکی تیپی ٢٥ی خاڵخالان

زۆر تەنگاو دەبێت و خۆ دەکاتە ناو ئاودەستخانەکانی سەرگەڵوو، کابرایەک لەناو ئاودەست خانەکە بوو، ئەویش هێند تەنگاو بوو خۆی پێ ڕانەدەگیرا، هەرچەند کابرا ئحم ئحم ئحم دەکات پێشمەرگەکەش ئارامی لێ هەڵگیرا بوو، هەر خۆی پێدا کرد، گوتی ئحم ئحم ئحمی چیتە من لە تۆپ و ئاربیجی نەگەڕاومەتەوە لە ئحم ئحمی تۆ دەگەڕێمەوە، لەبەر قەرەباڵغی ولەیەک کات هەڵدەستان وئاودەستخانە بەر نەدەکەوت، دەبوو نۆرە بگرن.

## بەیانیت باش!

١٥. لە شەڕی عێراق و ئێران خەڵکێکی زۆر ڕایان کردوو، بوونە سەربازی هەڵاتوو (فیرار) لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە، یان ناوچە ڕزگارکراوەکان دادەنیشتن ساڵی ١٩٨٢، ئەو سەربازە ڕاکردوانە بۆ گوندەکان خێروبەرەکەت ونموونەی پاک وخاوێنی بوون، هەندێ شتیان بۆ گوندەکان کرد، گەرماو وئاودەستی بە نایلۆن وخواردنی خۆش وخاوێنی وماکسی ژنان، زۆر لە سەربازە ڕاکردوەکان خێزاندار بوون وهاوسەرەکانیان خەڵکی شار بوون، زۆر لە سەربازە ڕاکردووەکان بوونە پێشمەرگە وکادیر و فەرماندە، هێزی پێشمەرگەیان بەهێز کرد، جارێک یەک لە سەربازە ڕاکردوەکانی گوندی (قەراڵی) بووە پێشمەرگە و چەکی شەرەفی لەشان کرد، تاقم و تفەنگی لەخۆ بەست، بەڕێکەوت کچێکی گوندی قەراڵی توش دەبێت، سەربازی

ڕاکردووی تازە پێشمەرگە بە کچەکە دەڵێت: بەیانیت باش، کچەکە دەڵێ بەخوا ببورە خوێندەواریم نیە.

## زیاتر پیس بوون!

١٦. (حەسەن زەردە) جەباری بوو، (پ.م) لە تیپی ٥٧ ی سەگرمە و ماوەیەک بوو خۆی نەشوشتبوو، چڵکن و هۆقەک چڵکی پێوە بوو لە گوندی (شێردەرە) دەیەوێ خۆی بشوات ساڵی ١٩٨٥، ماڵەکە ئاوی بۆ گەرم دەکەن و گەرماوەکە لایەکی مریشک لە سەر هێلکە ومریشکی کورکی لێ بوو، لە سەر کا و خۆڵە پۆت بوون، کە خۆی دەشواتن مریشکەکان دەردەپەڕن لەبەر پریشکە ئاوی گەرم، کا و تۆزی بەسەر دادەکەن! جەستە و گیانی پیستر ببوو، بۆنی جیقنە و مریشکی لێدەهات، کابرای خاوەن ماڵ لێی دەپرسێت جوان خۆت شووشت و خۆت خاوێن کردەوە، حەسەن زەردەیی دەڵێ: خۆزگە هەر خۆم نەشوشتبا، جاران خاوێنتر بووم ئێستا پیسترم.

## گوللە نەک زللە!

١٧. مام ڕۆستەم فەرماندەی تیپی ٢١ی کەرکوک بوو، لە شەڕێکدا سێ جاش بەدیل دەگرن ساڵی ١٩٨٢، یەک لە جاشەکان بەناوی (هـ.م) مام ڕۆستەم پێی دەڵێ زللەیەکت پیا بکێشم، یان فیشەکێک بنێم بەسەرتەوە، مام ڕۆستەم دەستی بەقەد

خاکەنازێک دەبوو، هەر زللەیەکی ڕاوەشاندبا، کەم زەلام هەبوو نەکەوێ بە ئەرزا، هێندە بەهێز بوو، جاشەکە بیردەکاتەوە زلەکە باشترە نامرێ، فیشەکەکە دەیکوژێ، بۆیە دەڵێ زللەیەکم لێدە، مام ڕۆستەم یەک بەهێزی خۆی زللەیەکی پێدا دەکێشێت، کابرای جاش دەکەوێت ودەبوورێتەوە، پاش ماوەیەک بەهۆش خۆی دێتەوە، بە مام ڕۆستەم دەڵێ گەر بەتەمای زللەیەکی دیکەم لێ دەی، پێی ناوێ یەک فیشەک بنێ بەسەرمەوە گوللە نەک زللە!

## بێ حەیا!

١٨. (عەدنانی حەمەی مینا) و (کوردۆ قاسم) و (مامۆستا عەلی گەرمیانی) (م. عەلی پەرلەمان) و (نەجم بۆسانەیی) هەموو لێپرسراوی دیار وناسراوبوون لە تیپی (٥٣)ی شێروانە، لە گوندی (...)ی گەرمیان بوون، بۆ کێشەیەک دەیانەوێ لێکۆڵینەوە بکەن لە ئافرەتێک سکی پڕ کرابوو (ئاوس) بوو لە ساڵی ١٩٨٤، ئەوەی کاری لەگەڵ کردبوو، ئافرەتەکە ناوی هێناو خۆی دەیناسی، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە مامۆستا عەلی لە ئافرەتەکە دەپرسێت، پیاوەکە چ نیشانەیەکی نەبوو لە دامێنی، چۆن چۆنی بوو کارەکە؟ چەند جار وای لێکردووی؟ بە ڕەزامەندی بوو یان بە تۆبزی بوو؟ ئافرەتەکە دەڵێ: ئەیەڕۆ چەند بێ حەیا و بێ شەرمی!، مامۆستا عەلی یەکسەر لێی تورە دەبێ و دەستی تا ئانیشکی درێژ دەکات و دەڵێ ئەوەندەیان تێ بڕیوی ئاوسیان کردووی، ئەوجا بە من دەڵێی بێ حەیا.

## ئازادی جەستە!

١٩. مامۆستا مەلا (م) خەڵکی شارەزوور بوو گەرچی مەلا و کەسایەتی بوو، بەڵام گەلەک مێباز و چاولەدەر بوو، بێ ڕابواردن عەجمینی نەبوو ساڵی ١٩٨٢، دیاربوو لە ناوچەکە کاری وا دەکات و کەسیش سکاڵای لەسەر تۆمار نەکردبوو، کەس گازاندەی نەکردبوو لێی، کەرتی ڕێکخستنی شارباژێر لە تیپی ٣٣ی سلێمانی بانگی مامۆستا مەلا (م)دەکەن، لێی دەپرسنەوە دەڵێن تۆ پیاوێکی داوێن پیسی وڕادەبوێری، خۆ شەرەف گاڵتە نییە! مامۆستا مەلا (م) دەڵێ جاسوس نیم، پیاو خراپ نیم، کوردم و دڵسۆزم، دزیم نەکردووە، خراپەم نەکردووە، ئاخر بۆ بانگم دەکەن و لێم دەپێچنەوە، کێشەم لەگەڵ کەس نییە، کەس شکاتی لێنەکردووم، کادیرانی کەرتی ڕێکخستن دەڵێن: ئاخر داوێن پیسی، لەگەڵ حیز وقەحپان ڕادەبوێری، مامۆستا مەلا (م) دەڵێت: ئەوە چی دەڵێن، هەر وڵاتێ، هەر جێیەک حیز وقەحپەی تێدا نەبێ هەر ئازادیی لێ نییە، هەر باوەڕم پێی نییە، دەبێ جەستە ئازاد بێ عەیبە بۆ ئەو مەسەلەیە بانگم دەکەن، لەهەر جێیەک ئازادی هەبێ جەستەی ژن ئازادە!.

## هەی سەگی سەگ باب!

٢٠. لە زستانی ١٩٨٢، مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی، لەناو دەربەندیخان جاشێک بە دیل دەگرن لە شەڕێکدا، جاشەکە

دەگرن، دەیبەنە گوندی (کانی سارد)، (حاجی محەمەدی حاجی کاکە ولای) حەمامان، کەسایەتی و میوان پەروەر وسوعبەتچی ومەلای گوندی کانی ساردیش بوو، تا بلێی جنێوفرۆش وبەپەلار بوو، ناو وناتورەی لە هەموو کوڕ و کچ و ژن و براکانی و دۆستەکانی نابوو، هەریەکە نازناوێکی بۆ دانا بوون، حاجی محەمەد دەزانێ پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە مزگەوتن، دەست دەکات بە جنێودان بە حزبی شیوعی و مارکس و لینین و سۆڤیەت، کابرای جاش سەری سوڕ دەمێنێ، چۆن ئەو حاجی و مەلایە، وا بێ منەت و ئازایە، بە کەیفی خۆی جنێو دەدا، پێشمەرگە و هاوڕێیانی حزبی شیوعی دەیناسن و خۆشیان دەوێت، بێ ئەوەی کەس پێی ناخۆش بێ یان وەرامی بدەنەوە، حاجی محەمەد نزیک دەبێتەوە لە سۆباکە، دەبینێ کەسێکی لایدە لەبەر ئاگری سۆبەکە بە کزی هەڵتووتاوە، حاجی محەمەد دەڵێ هێ کابرا تۆ چیت و کێیت؟ کابراش دەڵێ: جاشم گیراوم!، حاجی محەمەد لێی توورە دەبێت و تفێکی تێ دەگرێت و دەڵێ: هەی سەگی سەگ باب!، حیزەڵە دەردت گران بێ! بۆ چوار پێنجێک لەو سەگە شیوعیانەت نەدەتۆپاند.

## هەقم چیە بە ئیشی ژێر بە ژێرەوە!

٢١. سەرلقێکی پارتی لە گوندی ئەحمەد بڕنە بانگی کوێخای گوند دەکاتن دەڵێ: شیوعی لەو گوندە هەیە، کوێخا قادریش کە

کوێخای گوندی ئەحمەد بڕنە دەبێت دەڵێ، شیوعی لەو گوندە چ دەکات، کاکی سەر لق بانگی شێخ ئەحمەدی گوندی ئەحمەد بڕنە دەکات و پێی دەڵێ: شێخ ئەحمەد تۆ شیوعی شێخ ئەحمەدیش دەڵێ: بەڵێ شیوعیم، کاکی سەر لق ڕوو لە کوێخا دەکاتن پێی دەڵێ: نەتگووت شیوعی لەو گوندە نییە ئەوە شیوعییە، کوێخاش دەڵێ: جا من هەقم چییە بەسەر ئیشی ژێر بە ژێرەوە و ئەوە نهێنییە وشاراوەیە!.

## هەردووکمان شێتین!

٢٢. مەلا (ن.ک.م) لە دەستەی پاسەوانی (مام جەلال) بوو، مام (ئەحمەدی دادی) بە ئایەتوڵڵای ئاوبڕی ناو دەبرد، لە ڕادەبەدەر (مام جەلالی) خۆش دەویست، لە خڕێ نێوزەنگ لە بێ بەناو گەرماوی بە کەلەکە بەرد و داپۆشراو بە چادر، (مام جەلالی) دەشوشت و بنی پێی خاوێن دەکردەوە، (ن) بە بنەماڵە دۆستی دێرین بوون لەگەڵ (مام جەلال)، هێند بە پەرۆش و دڵسۆز بوو بۆ (مام جەلال) کەموکوڕی لێ قبوڵ دەکرا، کوڕی ماڵ بوو، کەم کەس لەگەڵی هەڵ دەکرد و نەدەگونجا، بێ هۆ وخۆڕا تووڕە دەبوو، ساڵی ١٩٨١ لە خڕێ نێرزەنگ مامۆستا شێخ عزەدینی حوسێنی دەچتە دیدەنی (مام جەلال)، مامۆستا کەسایەتییەکی هێند مەزن و ڕێزدار بوو لە کوردستان وئێران ڕەچاوی قورسایی وکەسایەتیی دەکرا مەلایەکی گەلەک گەورە

بوو، (مام جەلال) بە گەرمی ورێزەوە پێشوازییان لێ دەکات، بە ن.ک.م دەڵێ: دەی ڕۆڵە قاوە، چا بێنە! (ن)یش دەڵێ مەگەر قوزەڵقورتیان بۆ بێنم، مام جەلال خۆی تێک نادا وبەسەر خۆی ناهێنێ، بۆیە کە دەڕۆن بەڕێیان دەکا، بانگی (ن.ک.م) دەکات و ناشیەوێ توورەی بکاتن و دڵی بشکێنێ پێی دەڵێ: (ن) دەزانی من و تۆ هەردووکمان شێتین، (ن)یش بە هەموو عەقڵی خۆی دەڵێ: وەڵا (مام جەلال) من شێت نیم ئەتۆش کەیفی خۆتە!

## (با) هێناویەتی بۆ ژوورەکەم!

٢٣. خەلیل دهۆکی نوسەر و قەلەم بە دەست بوو، جەمەدانی بە نەریتی بادینانی لەسەر دەنا، جارێک لە ڕۆخ بەنداوی دوکان دەکەونە بۆسەوە، خەلیل دهۆکی ئەو مەلەوانەش نەبوو کەچی لە تاوان لە بەحرێ پەڕیبۆوە هاتبووە بناری کۆسرەت بە مەلە، بۆیە ناویان لێ نابوو خەلیل بەحری، لەناو ریزەکانی (ی.ن.ک) بوو پەیوەندی لەگەڵ ئاڵای شۆڕش بوو، بە ئاڵای شۆڕشیان دەگوت (ئاش) ئەو هێزە بوون لەناو (ی.ن.ک) جودا بوونەوە، کەوتنە بەر شاڵاوی گرتن و ئازاردان جا بەیاننامەیەکی ئاڵای شۆڕش لە ژوورەکەی خەلیل دهۆکی دۆزرایەوە، بە گیروگازیان هێنا بوو، نەیدەویست بیسەلمێنێ! لێیان پرسی بوو ئەو بەیان و بڵاوکراوەت لە کێ و لە کوێ وەرگرتووە، ئەویش گووتبووی لە کەسم وەرنەگرتووە بەڵکو (با) هێناویەتی بۆ ژوورەکەم، سەرەنجام بووە نوێنەری ئاش لە سوریا.

## ئەو هەموو ئەزیەت و مەسرەفەشمان بەلاش چوو!

٢٤. لە شەڕی قرناقاو وپشت ئاشان ساڵی ١٩٨٣، کە کوشتاری زۆری حزبی شیوعی وسۆشیالیستی لێ کەوتەوە، شەڕێکی خوێناوی بوو، سێوە قوڕیش پ.م بوو لە تیپی ٩٣ی کۆیە، لە پارچە کاغەزێک دەنوسێت (سەباح)، ئەو پارچە کاغەزەش بە رێکەوت لەسەر قەبرێک دادەنێن، مامۆستا سەباح عەبدوڵلا لە سەرکردایەتی کادیر بوو، لەو شەڕە لەوێ نەبوو بەشدار نەبوو بۆیە وا بڵاوبۆوە کەوا مامۆستا سەباح لە قرناقاو پشت ئاشان شەهید کراوە، براکانی دێن، هێستر و دارەمەیت و کفن و بۆن ئامادە دەکەن بە هەڵەداوان دەگەنە قرناقاو وپشت ئاشان گۆڕ هەڵدەدەنەوە، ماچی دەکەن و دەگریەن وشیوەن دەکەن دەڵێن مەیتە تێکچووە هەروا دەزانن سەباحی برایانە، دوایی دەزانن مامۆستا صەباح لە خڕێ نێرزەنگ و زەڵێ یە دەچنە ئەوێ و لە بارەگا دادەنیشن بە دیداری مامۆستا سەباح شاد دەبنەوە، پێ دەکەنن و شوکرانەی خودا دەکەن، دوایی یەک لە براکانی دەڵێ: وەرە ئەو هەموو ئەزیەت و مەسرەفەشمان بەلاش چوو!

## ئەبو تەخریب!

٢٥. ئەسکەندەر حاجی محمەدی گوڵن سەر لقی هێزەکانی حزبی شیوعی بوو عەرەبییەکی شەق و شڕی دەزانی هەندێ

پەندی عەرەبی کردبووە کوردی « ئەزروبەک واحید بیل رەئسی ئەل ئەحمەد ئەل مدەوەر، تەلاتە شھور شیتا ئەنتەراسەک بیل تین» بەو شێوەیە کردبووی بە کوردی:

**یەکێکت لێ دەم بە سوورەی سەرخڕ**
**سێ مانگەی زستان ســەر بنێیتە قوڕ**

هەندێ لەو پێشمەرگانە عەرەبی تێدا بوو جا ئەسکەندەر بە پێشمەرگەیەکی حزبی شیوعی کەناوی (ئەبو تەغرید) بوو، ئەو هەر پێی دەگوت (ئەبو تەخریب).

## ئیدە

٢٦. پوور فاتم خەڵکی گوندی دارەبەنی دۆڵە ڕەقە بوو،ماڵیان لەسەر جادەی سەرەکی نێوان سەرکەپکان – پڵینگان بوو، کاروانسەراو قۆناغی پێشمەرگە بوو، پوور فاتم مێوان پەروەرو لوتف خۆش بوو، پێشمەرگەکانی تیپی ٩٣ ی کۆیە زۆر لەوێ دەبوون دایک وکەس وکاریان لە ماڵی پوور فاتم دەبینن، دیاری وخواردنیان بۆ دەهات وێستگە بوو، پوور فاتم زاراوەیەکی جیاوازی هەبوو ئەوانەی زۆر لەوێ دەبوون چەند پێشمەرگەیەکی کۆیی بوون وەک (حەسەنە خوار و کاوە کۆر و سێوە قۆر و نەریمان رەفیق مدیر مال) بوون پوورە فاتم بەزاری شیرینی دەیگوت (ئیدە خوار واتە حەسەنە خوار، ئیدە کۆر واتە کاوە کۆر، ئیدە قۆر واتە سێوە قۆر، بە نەریمانی

دەگۆت (کۆترۆکە). ساڵی ١٩٨٥ کاوە کۆر (ئیدە کۆر) جیهازی لاسلکی هۆکی تۆکی پێ بوو، لەسەر شاخی پلێنگان بوو، شەڕ خەست و تۆپ باران بوو، قسەی دەکرد بە جیهاز لەگەڵ سێوە قۆر (ئیدە قۆر) لەبەر دووری و خشەخش و گرمە گرمی تۆپان و ناتەواوی جیهازەکە دەنگی یەکتریان نەدەناسی، سێوە قۆر دەڵێ بە چ بزانم (کاوەی) پێشمەرگەی، کاوە کۆریش دەڵێ بە چاوم!! واتە کاوە کۆر - ئیدە کۆر کاوەش دەڵێ ئەی بە چ بزانم ئەتوو (سێوەی) سێوەش قەت لە قسە و پەلار و نوکتە دانەدەما دەڵێ بە (گوونم) واتا ئیدە قۆر - سێوە قۆر!!!

## تەپڵ و تۆپ

٢٧. لە داستانی ڕزگاری ساڵی ١٩٨٧ تۆپ بارانێکی هێندە خەست وچڕبوو تۆپ بەتۆپ دەکەوت، وەخت وناوەختی نەبوو زۆربەی کات تۆپ باران وگرمە وبلاچەی تۆپ بوو، پێشتر کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە بەرگەڵوو پلینۆمێکیان بەست هێندە تۆپ باران بوو بۆیە ناویان نابوو (پلیتۆپ) حاکم ڕێبوار (ڕەفیق کەریم جاف) بە عەبدول ڕەحیم سەنگەسەری لێپرسراوی دەڵێ: سەرم بەو تۆپانە ژان دەکا وپێم ناخۆشە، گرمە گرمەکە ئیزعاجە بۆیە مۆڵەتم بدە بڕۆمەوە حەزم لەو زرمە زرمەی تۆپان نیە!! عەبدولڕەحیمیش دەڵێ: چی چی وادەزانی ئێمە بە تەپڵ و مۆسیقای دەزانین هەتا بەیانی ڕەقس وسەمای بۆ دەکەین!

## دۆڕاوی

٢٨. کوێخا ڕەسووڵی زوهدی خەڵکی دەرگەلەی مەنگوڕایەتی بوو، زۆر مام جەلال ویەکێتی خۆش دەویست، ماڵی لە حاجیاوە بوو لە هەڵبژاردنی گشتی ١٩-٥-١٩٩٢ بە عەشق وحەماسەتەوە کاری بۆ لیستی سەوز دەکرد، نەریتێکی هەبوو کە لە مەجلیسان دادەنیشت سەرینێکی زلی لە کۆشی خۆی دەنا، ئەوجا قسەی دەکرد. لەو هەڵبژاردنە یەکێتی و لیستی سەوز بردیانەوە لەو ناوچەیە، کچێک هەبوو لەگەڵ لیستی سەوز نەبوو، جیاواز بوو، دەنگی بەڕەنگێکی دیکەدا بوو، لە ڕقی کوێخا ڕەسوڵ پانتۆڵێکی سەوز (کەسک)ی لەبەرکرد بوو، لەبەر دەمی کوێخا ڕەسولی زوهدی بە ئیستیفزازەوە دەهات ودەچوو. کوێخا ڕەسول بانگی دەکا پێی دەڵێ: سەهووی لەوەش دۆراوی، لە ناوکت بەرەو خوار هی منە مادام کەسکت لەبەر کردووە، کچەکە دوایی پانتۆلە کەسکەکە دادەکەنێ و پانتۆڵێکی دیکە لەبەر دەکا! کوێخا ڕەسوڵ بە کەیف و زەوقەوە، سەرینێکی لە کۆشی خۆی نابوو دەیگوت (ئەوها دایەی دەگێم پانتۆڵم پێداکەند)!!!

## زیرەکی حاجی حەمەدەمین !

٢٩. حاجی حەمەدەمینی کوێخا ئۆمەری کوێخا وسووی ئیلینجاغی پۆلیس بوو، لە سەرەتای شۆرشی ئەیلولەوە بۆتە پێشمەرگە تا ساڵی ١٩٧٤ پ.م بووە! لە حوجرە وپۆلی خوێندنگا

نەیخوێندووە، خۆی فێری خوێندەواری کردووە پیتەکانی بە کەرەستە وکەلەپوور دەشوبهاند، بۆ پیتی (ن) دەیگووت مەنجەڵێک یەک کفتەی تێدابێ ئەگەر پیتی (ت) بێ مەنجەڵێک دوو کفتەی تێدابێ، بۆ پیتی (ج) دەیگووت هەوجارێک بەردێکی لە ژێر بێ، پیتی (ل) گۆچانی سەربەرەو خوار،ماڵی لە گوندی ئیلینجاغ بوو کادیرێکی حشع بەناوی (لێزان) دێتە لای، حاجی حەمەدەمین لێی دەپرسێت هاوڕێ لێزان ٣٦٦ یەکانە، دوانزدە فەرخە یەک داکانە چی یە!!! کادیر لێزان چەندی دەکا ولێک دەداتەوە نازانێ!! حاجی حەمەدەمین ئاخر لێزانی چی ئەمە نازانی!

ئەوە ٣٦٦ ڕۆژ و ١٢ مانگ و یەک ساڵە! حاجی حەمەدەمین لە چاو خۆی زیرەک ودونیادیتەو شیعر دۆست بوو، ساڵی ١٩٧٧ کۆمپانیایی نەوت کە کەوتۆتە چوار جوتیار بۆ شەریکەی نەوت حاجی حەمەدەمین بەو شێوەیەی باسی دەکاتن:

**هاتە لامان ئەو شـــەریکە**
**گشت ئینگلیز و ئەمریـــکا**
**خاکمان وا دەخۆن عەنتیکە**
**ئێمەش بێ مووچە و تیـکە**

حاجی حەمەدەمین لە کەرکوک پۆلیس بووە، زەمانی عەبدولکەریم قاسم عەرەبەکان هوتاف لێ دەدەن، داوا لە حاجی حەمەدەمین دەکەن بە کوردی دروشم بڵێ ئەویش ناچار هاوار دەکات:

**عەبدول کەریمی قارەمـــــان**
**کوێرت کردەوە نیشتمــــــــان**
**دایکەکەت دەگێین کشتمــــان**

***

**عــــــــەبدول کەریمی ئازیزم**
**من رۆڵەی چواردەی تەمووزم**
**بەهێزەکەتدا دادەمیـــــــــــزم**

چەپڵەی بۆ لێ دەدەن وهاوار دەکەن عاش عاش

## بلی بلان

٣٠. سیروانی عەبلی عەبان برای بەکری عەبلی عەبان پ.م بوو لە مەکتەب عەسکەری، سیروانی عەبلی عەبان رێکخستن بوو، بە نهێنی بە شەو کەس نەیبینێ دەیەوێ دەنگوباسێکی گرینگ بە پێشمەرگە رابگەینێ و بگەرێتەوە، دەگاتە (گورگەیەر) لە شاربازێر کە دەگاتە شوێنی پێشمەرگە دەنگی دەدەن، زەلام کێی، کابرا دەبێ نهێنی بڵێ دەنا ناهێڵن بچێتە پێش وتەقەی لێ دەکەن بۆیە سیروانی عەبلی عەبان نهێنی شەو نازانێ ودەڵێ خۆمانین کابرای ئێشکگر چەک رادەکێشێ خۆتان کێن! ناچار سیروان دەڵێ سیروانی عەبلی عەبانم کابرای پێشمەرگە ناوی وای هەر نەبیستووە دەڵێ من بلی بلان ناناسم هەر بێیتە پێش دایکی خۆت وبلی بلانیش دەگێم!!

## (ئەنووری حەلاو)

٣١. شێخ عومەری سەید حاجی خەڵکی سلێمانی ناسراو بە عومەری ئیدارە خۆی قسەخۆش و نوکتەباز وشیعر دۆست وبەبەزم ورەزم بوو شیعرێکی لەسەر ئەنووەری حەلاوی پێشمەرگەی دێرین وسوعبەت چی دانا بوو بەو شێوەیە:

**ئەنووەری حەلاو، شازی تاکە پیاو**
**بۆ قسەی نەستەق بۆ کاری شیاو**
**بەس گوێی لێ بگرە وکەمێ بیدوێنە**
**هەرکە جوولاندت ئیتر وازبێنە**
**چونکە ئەتداتە بەرتانەو تەشەر**
**هەر سی ودوو ددانت لە دەم دێتە دەر**
**چونکە ئەوەندە تۆ پێ ئەکەنی**
**خوا لەشت ساغ کات ئەنووەرە فەنی**

## چەندم گۆ

٣٢. پارتی کاری سەربەخۆ لە حزبی شیوعی جیا بۆوە، بارەگای خۆیان دادەنا، یەک لەو بارەگایانە لە شارۆچکەی تەق تەق بوو، ئەندامێکی حزبی شیوعی بە ناوی (قادر قەباغ) بە پیلانی حزبی شیوعی هاتە بارەگای تەق تەق ساڵی ١٩٩٤ شەربەت وپاقلاوە وشیرینی لە کەرکوکەوە لەگەڵ خۆی هێنا بوو، گوتی ژنم مارە کردووە، تومەز حەبی بێ هۆشی خستبوە

ناو شەربەتەکەوە، چی ئەندامی کاری سەربەخۆ هەبوو هەمووی بێ هۆش لێی کەوتن وخەوتن، کاکی شیوعیش هەموو بارەگای پێچایەوە چی تێدا بوو هەمووی لەگەڵ خۆی بردە بارەگای حزبی شیوعی لە کەرکوک، ئیتر سەرانی پارتی کاری سەربەخۆ بەو پیلانە زۆر نیگەران بوون کابرای شیوعی گوتبووی مولک وکەرەسەی حزبی شیوعیم هێناوەتەوە چانیە کاری خراپم لەگەڵ نەکردوون مەمنوون بن ئیتر منداڵ لە تەق تەق هاواریان دەکرد:

**پارتی کاری سەربەخـــۆ**

**چەندم گۆ شەربەت مەخۆ**

## دابڕاو ودانەبڕاو

٣٢. محمەدی مام رەحمانی دێگەڵە، بە دڵسۆزیی (ی.ن.ک) هەر لەگەڵ ڕێکخستن پەیوەندی هەبووە، جا لەناو سیاسەت وپێشمەرگایەتی دابڕاو ودانەبڕاو دێتە باسکردن، بە محەمەدی مـام رەحـمـان دەڵێن تـۆ دابــڕاوی لـە ( ی.ن.ک) محەمەدیش دەیگووت قەت دانەبڕاوم لە یەکێتی هەر یەکێتی لە من دابڕاوە، من هەر لەجێی خۆم بوویم هەر یەکێتی بوویم بەڵام یەکێتی هاتووە ورۆیـوە بە جێی هێشتووە لە ناوچەکە هاتۆتەوە من هەر ماومەتەوە هەر یەکێتی بوویم بۆیە ئەو دابـڕاوە من لێی دانەبڕاوم!!

## بەگوو

٣٤. بەرزانی قاله خەڵووز یەک لە قسەخۆشەکانی پێشمەرگە بوو قسە لە مست بوو، ساڵی ١٩٨٩ لە قاسمە ڕەش لەگەڵ لێپرسراوێک کە نازناوی (بەگوو)ی پێوە بوو لە بەدبەختی بە بارزان دەڵێت توخوا ئەوە لەقەبە( قاله خەڵووز ) ئەویش دەڵێ من زور مەمنونم چانیە قاله بەگوو نەبوو!

## مریشک لێدان

٣٥. کۆمەڵە ڕێکخراوی مارکسی لینینی بوو دەنووسرا (م.ل) کورت کرابۆوە مام جەلال کە توورە دەبوو لە هاورێیانی کۆمەڵە بە میم لامەکەی کۆمەڵەی دەگوت مارکسی لینینی نییە، مریشک لێدانە، هاوزەمان لەگەڵ کۆمەڵە کە باڵی سەرەکی بۆو، یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستانیش هەبوو جا مەکتەبی ڕێکخستنی هەبوو مەکتەبی ڕێکخستنی یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان بە کورتکراوەیی دەبووە (م.ر.ی.ش.ک) پێکەوە گری بدەی دەبووە (مریشک) کۆمەڵەی ڕەنجدەرانیش دەبوو (کڕ).

## ئەوەشت هەبوو خۆت تەقاندەوە:

٣٦. ئەنسار ئیسلامێکی خۆکوژ لە بازگەی داودیە لای قەلادزێ دەیویست خۆی بتەقێنێتەوە لە بارەگای فەوجی پێشمەرگە لە گوندی سەید ئەحمەدان، بەڵام دەوری گیرا ونەگەیشتە شوێنی

دیاریکراو، ڕاست خۆی تەقاندەوە، پارچەپارچە بوو، هەر پارچە جەستەی کەوتە جێیەک، پیرەمێردێکی ئەوێ گەڵوگونی دەدۆزێتەوە، هەڵی دەگرێ دەڵێ سەگباب ئەوەشت هەبوو خۆت تەقاندەوە!!

## ئەو هەموو دوژمنە!

٣٧. هەواڵنامە بڵاوکراوەیەکی (ی.ن.ک) بوو لەشاخ دەردەچوو جارێک حەمەسەعیدە قەڵەو لەبن چادر تایپی بابەتێکی دەکرد وهاوڕێ جەبار بۆی دەخوێندەوە ئەمیش چاپی دەکرد! مانشێتی وتارەکە ئەوە بوو کۆنە پەرستانی ئێران وتورکیا وعێراق وقیادە موەقەتەی پارتی پیلان دەگێڕن دژی شۆڕشی پیرۆزی گەلەکەمان، لەکاتی تایپ وخوێندنەوە تاقمی پێشمەرگە بەمیوانداری دێتە لایان، هاوڕێ جەبار نایخوێنێتەوە تا حەمەسەعید تایپی بکا، چەندی لەگەڵی دەکاو نایخوێنێتەوە، کە تاقمە پێشمەرگەکان دەڕۆن حەمەسەعیدە قەڵەو دەڵێ بۆ نەت دەخوێندەوە خۆ نهێنی تێدانەبوو؟ هاوڕێ جەبار دەڵێ چ بخوێنمەوە ئەو پێشمەرگانە بزانن یەکێتی ئەو هەموو دوژمنەی هەیە، پارتیش ئەو هەموو دۆستەی هەبێ، ڕێک تەسلیم دەبوونەوە ودەڕووخان!!

## خۆش داکەنە:

٣٨. مامۆستا عەزیز عەلادین بەهۆی کوردایەتی وپێشمەرگایەتی پاش ئەنفالەکانی ساڵی ١٩٨٨ کەوتە سەر سنور دوایی بۆ شاری (سەقز) لەگەڵ خێزانەکەی لەوێ دەژیا ومالی دانا!

بە گۆچان و ڕیشێکەوە دەگەڕا بۆ خۆی شتیماڵەوەی دەکڕی جارێک بە ڕێکەوت بە میوە فرۆشێکی سەقز دەڵێ خۆش داکەنە کیلۆی بە چەندە! لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بە جۆرە پرتەقالێک دەڵێن خۆش داکەنە چونکە توێکڵەکەی بە ئاسانی دادەماڵدرێت و لێی دەبێتەوە!

کابرای میوەفرۆش تووڕە دەبێ ودەست بە جنێودان دەکات دەبێتە شەڕیان م.عەزیز بێ مەبەست وای گووتبوو تومەز کابرای میوەفرۆش کوڕی فاتە خۆش داکەنە بووە بۆیە تووڕە بووە وایزانیوە هانیان داوە!!

## پارەی خیانەتم ناوێ

٣٩. رەسوە شێتی گەرمکان هەبوو لە قەلادزێ، خێر خوازان پارەیان پێ دەدا و وەریدەگرت، جارێک سەرۆک جاشێک (٥) دیناری سویسری دەداتێ، رەسوە شێت وەریناگرێ دەیکاتە (١٠) دینار هەر وەریناگرێ، سەرۆک جاش دەڵێ بۆ وەریناگری چییە پێت کەمە!! رەسوە شێت نەوەڵا پێم کەم نییە بەلام وەلاهی حەیفە

تۆ بە گەوادی وجاشایەتی پەیدای دەکەیت پێم حەرامە وەری بگرم، پارەی جاشایەتیم ناوێ حەرامە هی خیانەتە!!

## لەناو قینگت بیشارەوە:

٤٠. حاجی ئومێدی سەعید گەوهەر گیرابوو لەسەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، ح.ح.غ تەلەفۆنی بۆ دەکات دەڵێت سەردانت دەکەم کێرێکی لاستیکیشم بۆ هێناوی حاجی ئومێد دەڵێ بەخێربێی زۆر سوپاست دەکەم بۆ دیارییەکەشت زۆر سوپاس ومەمنونم بەس لە بازگەی بەندیخانە ناهێڵن بیهێنیە ژووری بۆیە تکایە کاک ح.ح.غ لە ناو قنگی خۆت بیشارەوە، تا بگاتە دەستم بەئەمانەتەوە.

## تاقم

٤١. تاقم بۆ زۆر شت لە کوردیدا بەکاردێت تاقمی قەنەفە وتاقمی ددان وتاقمی مەخزەنی فیشەک، پێشمەرگەیەک بەمێوانی لە مەکتەب عەسکەری (ی.ن.ک)دەبـێـت، تاقمە مەخزەنەکەی دادەنێ و دەکەوتە ناو سەرین و ڕایەخان دیار نامێنێ دەیەوێ بڕوا خۆی ببەستێ، دەڵێ زەحمەت نەبێ تاقمەکەم لەکوێیە دیار نییە حاجی ئومێد دەڵێ لەناو دەمی(رەزا)یـە تومەز پ.م رەزا ددانەکەی تاقم بووا .

## بێ ئیشی

٤٢. لە قاسمە ڕەش مام ساڵحەڕەش مالوومەیی پاسەوانی مام جەلال دەبێ، مام جەلال لە ژووری بارەگای خۆی بوو مام ساڵحەڕەش بە مام شێرکۆ دەڵێ کە بەوێدا تێدە پەڕێ دەڵێ مام شێرکۆ وەرە با دووقسان بکەین مام شێرکۆ دەڵێ لێم گەڕێ ئیشم هەیە مەشەوەشم مام ساڵحەڕەش دەڵێ ئەو مام جەلال لێپرسراوی هەموو کوردە ڕابەر وسکرتێری گشتییە وسەرۆکە هیچ ئیشی نییە تۆ ئیشی چت هەیە سەلامەت بێ!!

## زاپت

٤٣. سەید ئەحمەدە شێت لە تیمارۆکی دەشتی کۆیە لەدایک بوو بوو، بەریچەلەک سەرگەڵوویی بوو شیتیکی سەیر بوو جارێک دەبینێ مام سیامەند تیمارۆکی ئامیر لیوا ئۆتۆمۆبێل لێدەخوڕێ، پێی پێدەکەنێ ئەویش دەڵێ سەید ئەحمەد بەچی پێ دەکەنێ، ئەویش قسبە ناکا دوایی مام سیامەند بەڕووی خۆش دەڵێ توخوا بەچی پێکەنی ئەویش دەڵێ: کوڕە چی ئەتوش وات لێ هاتووە سەیارە لێبخوڕی!! جارێکی دیکە لە پشت ئۆتۆمبیلێک دەبێ، لەگەڵ خەڵکی بە یەکێکیان دەڵێ خەڵکی کوێی ئەویش دەڵێ تیمارۆک دەیانەوێ لە کۆیە بچنە دەشتی کۆیە سەید ئەحمەد دەبێت دەی بڵێ (زا) کابراش لە ترسان هەر دەڵێ زا سەید ئەحمەدیش دەڵێ (پت) چەندان جار ئەو دەڵێ (زا) سەید ئەحمەدیش دەڵێ (پت)

تا دەگەنە ئاستی تیمارۆک کابرای تیمارۆکی دەڵێ شەقم برد توخوا بۆ وا دەڵێی مانای چییە هەر گوتم (زا) تۆش گوتت (پت) سەید ئەحمەدیش دەڵێ ماڵت بەقورگیرێ هەموو تیمارۆک بوونە (زاپت)! ساڵی ٢٠٠٣.

## دروشم

٤٤. خدری پاشای دزەیی بۆتە چەکداری میری لە شەستەکان دەگەڕا لە گوندەکانی دەشتی هەولێر، بۆیە خەڵکی ناوچەکە دەیانووت:

**مستەک گەنم و مستەک ماش**
**خدری پاشای بۆتە جـــــاش**

گوایە ئەویش گوتوویەتی:

**نە لەبرسانە نە لەترسانە**
**خــدری پاشای فرسانە!**

*******

دروشمەکان مانایان هێندە نەبوو کەچی حەماسەت خوڵقێنەر و وروژێنەر بوو خەڵکی پێ دەجوولا هەرای دەنایەوە ودروشمی ئاگرین بوون:

**بەهێزی مامە ڕیشــــــە**
**سەدام دەدەین لـە شیشە**

***

**هێزی عەلی عەسکــەری**
**ســەدام بێتە نۆکــەری**

یان کچان هاواریان دەکرد:

**ئەو سینگە نەرم ونــۆڵە**
**بۆ پێشمەرگەکانی کۆمەڵە**

## قوڕتان بەسەری !!

٤٥. مامۆستا عەلی حەویز ماوەیەکی زۆر بوو ماڵ ومنداڵەکانی نەبینیبوو چووبوونە سوریا، دوایی ڕێگا دەدرا کاری پەیوەندی دەرەوەی پێدەسپێردرا لە دیمەشق کە دەگاتە سوریا، تەلەفۆن دەکات بۆ خێزانەکەی، دەڵێ: قوڕتان بەسەری ئەوە هاتم لەبن هەنگڵتانم، کێوە دەچن.

## لەبەر خاتری من با بەشدار بێ

٤٦. مام باپیری کوێخا کەریمی چنارتوو قاچێکی شەل بوو لەگەڵ برا وبرازاکانی هاتە دەرێ کەرتێکیان کردەوە بە ناوی کەرتی چواری چنارتوو هەمزەی کوێخا کەریمی فەرماندەیان بوو، ئەو دەم (ی. ن.ک) دوو ڕێکخراو بوو (کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان) سەرجەم کەرتەکە شۆڕشگێڕان بوون بەس عەبەی مەلا نەبێ ناسراو بە عەبدوڵلا کۆمەڵە، هەموو جار دەیانگووت بەس عەبەی مەلامان لەگەڵ نییە، جارێک کەرتەکە کۆبونەوەی شۆڕشگێڕان

دەکا وەک ڕێکخستن عەبەی مەلا بە تاقی تەنیا بەشدار نەبوو، مام باپیرە شەل دەبینێ دەڵێ بۆ بەتەنیای دەڵێ کۆبونەوەیان هەیە مام باپیر پەلی دەگرێ دەیباتە کن شەماڵی شێخ حوسێنی تەکبەسان دەڵێ دەبێ لەبەر خاتری من بەشداری کۆبونەوە بکاتن!! شەماڵی کادیر دەڵێ ئاخر نابێ مام باپیر نابێ چۆن دەبێ ئێمە شۆڕشگێڕانین ئەو کۆمەڵەیە دوو ڕێکخراوی جیاوازین، مام باپیر دەڵێ بەخوای نابێ لەبەر خاتری من دەبێ لە کۆبونەوەکەتان هەر بەشدار بێ!!

## چۆن چۆک دادەدەی!

٤٧. نەسرەدین هەورامی کادیری دیاری (پ.د.ک) لە پاش ئەنفالەکان لەسەرسنور بووین خەڵک خۆی ڕادەستی ڕژێم دەکات یەکێک لەو پێشمەرگانەی نەسرەدین هەورامی دەیەوێ بچێتەوە عێراق وخۆی ڕادەست بکات، نەسرەدین هەورامی زۆری پێناخۆش دەبێت، دەڵێ چۆن دەبێ لەسەرەتای شۆڕشەوە لەگەڵمانی، چۆن چۆک دادەدەی؟ پێشمەرگەکە دەڵێ خۆم نەڕووخاوم بەس ژنەکەم واز ناهێنێ دەڵێ گەر نەیەوە من هەر دەچمەوە چونکە لە شۆڕش وخەبات وشاخ وداخ وئاوارەیی نابم، نەسرەدین هەورامی دەڵێ باشە خۆم قسە لەگەڵ خێزانەکەت دەکەم، دەچێتە کن خێزانی پێشمەرگەکە ژنەکە بڕیاری داوە نایسەلمێنێ دەڵێ هەر دەڕۆینەوە چەندی لەگەڵی دەکات سودی

نابێ! نەسرەدین هەورامی بە ژنەکە دەڵێ: دەزانم بۆ گاندان دەچیتەوە، مەرۆوە تا ئیمام مەهدی لەسەر کەل دەردەکەوێ شەرت بێ هەموو ڕۆژێک جارێکت بگێم!!

مەبەستت گاندان نییە!!

## چەکی قورس چەک ناکرێ

٤٨. محێدین تیمارۆکی فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٩٣ی کۆیە زۆرجار پێشمەرگەکانی دەبردە گوندەکەی خۆیان (تیمارۆک) پێشمەرگەکانیش حەزیان نەدەکرد، جارێک لە هەڵەتەکانی گوندی (کاولان) دەبێ لەدەشتی کۆیە لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢دەڵێ بابچینە تیمارۆک، پێشمەرگەکانی پێیان ناخۆش دەبێ، دەڵێن ناچین لە کەرتەکەیان ڕەشاش دیکتاررۆف و R.B.G تێدا بوو، محێدین تیمارۆکی دەڵێ گەر نەیەن هەمووتان چەک دەکەم وچەک دابنێن، پێشمەرگەکانیش چەک دادەنێن محێدین دەزانێ ئەو هەموو چەکەی پێ هەڵناگیرێ دەڵێ چەکی قورس چەک ناکرێ، مێژووی گەلان بخوێنەوە، چەکەکانی هەموو لە جەمەدانیەکەی دەکاتن جەمەدانیەکەش دەدڕێ وپەشیمان دەبێتەوە، پێشمەرگەکانیش پێ دەکەنن وچەکەکانی تا ماوەیەک لێ وەرناگرنەوە!!

## انشاالله شەهید شود

٤٩. پاسدارى ئێرانى تێکەڵاوى پێشمەرگە بوو بوون، هەندێکیان قورئانیان پێبوو، یەک لەو پاسدارە قورئان بە دەستانە بە ئەنوەرى حەلاو دەڵێ(انشاالله شەهید شود) ئەنوەرى حەمەلاویش دەڵێ انشاالله گووت خوارد!!.

## لە مێردەکەم زیاتر دەترسام!

٥٠. مامۆستا عومەرى حاجى پاشا پیاوێکى پاک وقسە خۆشە بەڵام حزبایەتى وکوردایەتى ناکا، ژنەکەى خانەقینى بوو بەناوى (لەیلا کەریم عەلى) لە ڕۆژگارى سەخت ودژوارى شۆڕش وکوردایەتى سەربە (ى.ن.ک)بوو لە ڕێکخستنى نهێنیى ناو شار بوو سەر بە ڕایەڵەکانى (ى.ن.ک)، بەعس هەر زمانى چەقۆى دەزانى، مەرگ وسێدارە بوو ژنەکەى پاش ڕاپەڕین دەیگوت بەعس چەند دڕندە وبکوژ وترسناک وبەسام بوو بەڵام ئەوەندەى لە عومەرى مێردم دەترسام ئەوەندە لە بەعس نەدەترسام کە پێى بزانێ من لە ڕێکخستنى(ى.ن.ک)م!

## هەر بە هەوەس

٥١. ئیبراهیم جەلال نامیلکەیەکى نووسى بەناوى بۆ کۆمەڵەى ڕەنجدەرانى کوردستان کوردستانییە؟! جارێک لە بارزانى قالە خەلووز دەپرسن بۆ کۆمەڵە کوردستانییە؟ بارزانیش دەڵێ: هەر بە هەوەس.

## با ئەو بوتڵەی عارەقە بگرین!

٥٢. ساڵ ١٩٨٣ ئەنوەری حەلاو وچەند پێشمەرگەیەک بوتڵە عارەقێک پەیدا دەکەن ودەخۆنەوە، یەک لە پێشمەرگەکان سەرگەرم وزەوقی دەبێ وحەماسەت دەیگرێ، بوتڵە عارەقەکەش زۆری تێدا ماوە، مەیلەو مەست دەبێ، بە ئەنوەری حەلاو دەڵێ بابچین ڕەبایەک بگرین ئەنوەری حەلاویش دەڵێ جارێک با ئەو بوتڵە عەرەقە بگرین دوایی ڕەبایە گرتن ئاسانە!

## سەگوەڕ

٥٣. محەمەد موکری لەشاخ (سەگوەڕ)ی نووسی، بووە هەرا چونکە سکرابی سیاسی بەکار هێنابوو، چووە کن مام جەلال ڕێزی گرت وپێشەکیشی بۆ نووسی وپشتیوانی لێکرد، بەڵام تێی گەیاند سکرابی سیاسی چییە و کێیە؟ هاوکاری کرد بۆ زیاتر نووسین و برایم جەلال لە هەموان زیاتر تووڕەتر بووبوو دەیگووت بەڕاستی ((سەگوەڕ)) سەگوەڕە!!

## سینگی فراوانە!

٥٤. برایەکی مامۆستا عومەری حاجی پاشا بووە پێشمەرگە بەناوی (قوباد) لە تیپی٩٢ی کۆیە، ناکۆکییان هەبوو لەناو خێزان، قوباد هەڕەشەی لە حاجی پاشای باوکی دەکرد، مامۆستا عومەری حاجی پاشاش برا گەورەی بوو هاتە دەشتی کۆیە

ئامۆژگاری بکات! لەڕێگادا تووشی مامۆستا سـالار ئەحمەد حەوێزی دەبێ، مامۆستا سالار لە پێشمەرگایەتی سەرپەرشتی مامۆستایانی شۆڕشی دەکرد، کە مامۆستا عومەر دەبینێ دەڵێ: یاخوا بەخێربێی؟ بەڕاستی شۆڕش سینگی فراوانە وباوەشت بۆ دەگرێتەوە، مامۆستا عومەر بۆچی هاتووە، دەڵێ سینگ فراوانی چی؟ من هاتووم برایەکەم بەناوی پێشمەرگایەتی هەڕەشەی لەبابم کـردووە، زەمـان دێت و دەڕوا مامۆستا سـالار تاهیر حەوێزی تەسلیم دەبێتەوە، مامۆستا عومەر لەکن مەکتەبی ئولا دەبینێ دەڵێ یاخوا بەخێربێیەوە بە ڕاستی حکومەت سینگی فراوانە ولە باوەشت دەگرێ، مامۆستا سالار دەڵێ وەختی ئەو قسانە نییە.

## مەڵبەند بۆ کوێ بەرم

٥٥. شەڕی عێراق و ئێران گەرم بوو، شەڕیش کەوتە ناوچەی بیتوێن مەڵبەندی یەکی( ی.ن.ک ) بارەگای لەو ناوچەیە بوو کەوتە بەر پەلاماری ئێران وعێراق وبەرەی جود، ئەودەم بەکر حاجی سەفەر لە مەڵبەند بوو، دەبوو بارەگای مەڵبەند بگوازنەوە، لەوسەر و وەختە بەهادینی حەلیم سروودێکی هەڵبەستبوو بەو شێوەیە:

**ئەی هاوڕێیان من ڕەنجدەرم**
**من بەکری حاجی سەفـــەرم**

## جاش و عەسکەر هاتنە سەرم
## مەڵبەندی یەک بۆ کوێ بەرم

### پاک نەبوونەوە

٥٦. ساڵی ١٩٨٥ دایکی سەربازێکی ڕاکردوو دەچێ بۆ حەج، دەگەڕێنەوە دەچێتە کن کوڕەکەی و ناو پێشمەرگەکان، بۆیان دەگێڕێتەوە چەند دوعای بۆ کردوون وسەلامەت وکوردستان سەرکەوتوو بێ، دوایی دەڵێ لەکاتی ڕەجمکردنی شەیتان ئەوەندەم بەرد تێگرت ونەعلەکانیشم بۆ هاویشت وتم شەیتانی سەگباب کەتن وگوناحت زۆر پێکردووم، پەندت پێداوم، هەڵت خەڵەتاندووم، کوڕەکەشی گوتی دایە بەگوێرەی قسەکانت بە حەجێک پاک نابیەوە ودایکیشی گوتی ڕۆڵە ئەی ئەوانەی باوکت لە چاوی من هیچ نییە بەچوار حەج وچوار عەمرەش پاک نابێتەوە، کوڕە سەربازە ڕاکردووەکە گوتی وا بزانم دایک و باوکی من!! لە مەلها کاریان کردووە!!

### لەدەستدان

٥٧. دڵزاری بەکراغای حەوێزی لەناو (ی.ن.ک) لەشەڕێکدا هەردوو چاوی لەدەستدا، د.مشیر حەمە غەریب لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ تەسلیم نەبۆتەوە هەر درێژەی بە خەبات وپێشمەرگایەتی داوە، لەگەڵ خێزانەکەی کێشەیان کەوتە

نێوان لێک توران، جارێک دادەنیشن، وەستا عەلی وەستا شاکری دەست بە بۆڵەبۆڵ وگلەیی دەکا، وەک شێت پەلاماری دەدا تەبیعەتی ناخوش بوو، د.مشیر دەڵێ وەستا عەلی گوێ بگرە: دڵزار لەسەر یەکێتی هەردوو چاوی لەدەستدا، من لەسەر یەکێتی ژنەکەم لەدەستچوو، ماڵم لێ تێک چوو، تۆش لەسەر (یەکێتی) عەقلت لەدەستدا!!

## بەلەسە بووە

٥٨. نەوشێروان مستەفا جێگری سکرتێری (ی.ن.ک) بوو، بەهۆی شەڕی ناوەخۆوە ٣٢ ڕۆژ لەلای حزبی شۆشیالیست گیرا بوو سەرەنجام خۆی قوتارکرد وهەڵات ولە گوندی (پەرخ) لە خۆشیان پێشمەرگەکانی(ی.ن.ک) تەقەی خۆشیان کردبوو، ژنێک لەوێ لە ژنێکی دیکەی پرسیبوو ئەو پێشمەرگانەی (یەکێتی) بۆچی تەقە دەکەن؟ ژنەکەش لە وەڵامدا گوتبووی (یەژن مەنسولێکی زلیان) بەلەسە بووە!

## ئاش و تەڕەماش

٥٩. سەید کاکە ئەندامی م.س حزبی سۆشیالیستی کوردستان بوو، لەناو سۆشیالیست گرووپێک جیابوونەوە بە سەرکردایەتی قادر عەزیز سەرەتا ناویان (ئاڕاستە)بوو دوایی بوونە زەحمەتکێشان و ئایندە، لەناو (ی.ن.ک) گرووپێک جیا

بوونەوە بەناوی (ئاڵای شۆڕش) بە سەرکردایەتی مەلا بەختیار، جا سەید کاکە کە باسی ئەو دوو حزبە جیابۆوەی لە سۆشیالیست ویەکیتی دەکرد دەیگوت: ئاشەکەی ئەوان وتەڕەماشەکەی مە!

## کلک مشک

٦٠. لە پاش ٣١ ی ئابی ١٩٩٦ ڕێکخستنەکانی (ی .ن.ک) لە هەولێر بە حەسرەتەوە بوون (ی.ن.ک) بگەڕێتەوە ناو هەولێر، بە ڕێکەوتن پێکهاتن، بتوانن کاری تێدابکەن، (ی.ن.ک) لەگەڵ (پ.د.ک) ڕێکەوتنامەی ستراتیژیان کرد، بارەگای مەکتەب ڕێکخستن (ی.ن.ک) بەشێکی گەڕاوە ناو هەولێر بارەگایان دانا لە جێیەک ناوی (کلک مشک) بوو، ئەوەی ئەوان خەیاڵیان دەکرد وا دەرنەچوو، بۆیە دەیانگوت وامان زانی یەکێتی بێتەوە (کلکی شێر)دەگرێ کەچی کەوتە سەر (کلکە مشک).

## پێم دەگیرێ وبەس ئیمانم پێ نییە

٦١. مام ڕۆستەم لە ڕەمەزانێکی ساڵی ١٩٨٣ دەچێتە ماڵێک بۆ نیوەڕۆ هیچیان نابێ بیخۆن، دەڵێن ڕەمەزانە وبەڕۆژووین ئەویش دەڵێ سبەی بە ڕۆژوو دەبم، سبەی بە ڕۆژوو دەبێ وەختێکی کەمی دەمێنێ بۆ بانگدان وبەربانگ، ڕاست مام ڕۆستەم دەیشکێنێ دەڵێن بۆ وادەکەی؟ ڕوو لە ئاسمان دەکات ودەڵێت پێم دەگیرێ بەس ئیمانم پێ نییە!

## پارەی لۆ چییە ؟

٦٢. سەید کاکە وا بەناوبانگ بوو کە ڕەزیلە وپارەی خەرج ناکا، هەرنان وماست ونان وکەرەوز دەخوات! جا سەید کاکە لە ئەندامی سەرکردایەتیی حزبی سۆشیالیستەوە بووە (پ.د.ک) و کرا بە ئەندام پەرلەمان، سەید کاکە قسەی خۆی دەکرد، جا دەیانگوت سەید کاکە با قسە نەکا دوایی نانی دەبڕن، مام غەفوور فەرماندەیەکی دیاری (ی.ن.ک) دەیگوت: جا با نانی ببڕن سەید کاکە چ گوێی لێیە؟ نەپارە خەرج دەکات نەنانی دەخوا هەر نان وماست ونان وکەرەوز دەخوات!! پارەی لۆ چییە!

## k.n.n

٦٣. نەوشیروان مستەفا جیابۆوە لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان گۆڕانی دروست کرد ساڵی ٢٠٠٩ و کەناڵی ئاسمانی تەلەفیزۆنی دامەزراند بەناوی ( k.n.n) لە مام ڕۆستەم کەرکوکی دەپرسن ئەری k.n.n یەعنی چی ئەویش گووتبووی بۆچی نازانن؟ یەعنی کاکە نەوەی نەگبەت!!

## بەتەلاقم

٦٤. ئەمریکییەکان لە ساڵی ٢٠٠٤ لە ناوچەی هەڵەبجە لە جوندولئیسلامیان دا لە دەریای سوورەوە ڕەبیە بەڕەبیە ومۆڵگە بەمۆڵگە لێی دەدان ونیشانەی دەپێکا، بەموو هەڵەی نەدەکرد

وای لێ دەدان، ئاودیوی ئێرانیان حردن، جا لە ناوچەی هەورامان بوون لەوێ نەمان! کابرایەکی هەورامی سوێندی خواردبوو دەیگوت هەر تۆپ وگرۆزێک زەلامێکی هەورامی لەگەڵ بووە ئەگینا چۆن وا شارەزایە!! مەعقولە لە دەریای سوورەوە لەبنی دنیایەوە، لەسەر دەریایەوە، لە ڕەبیەکی دەگا شێخان وسەرگەت وبیارە وگوڵپ ودەرەی مەڕ وئەحمەئاوا وهانای دن بدات و سەر نەکا!! نیشانە بپێکێ!

## چای تەئخیر هێنا کوشتم

٦٥. مام ڕۆستەم کەرکوکی فەرماندەی تیپی ۲۱ ی کەرکوک بوو، زوو زوو دەهاتە دەشتی کۆیە ساڵی ۱۹۸۳، مام ڕۆستەم نەریتێکی هەبوو لەدوای نانخواردن دەبوو یەکسەر چابخواتەوە، پێی وابوو چەوری ڕادەماڵێ وبۆ تەندروستی خۆش وباشە، جا گەر دواکەوتبا، ڕووی لە کوڕەکە دەکرد بۆ ئەوەی کابرای خاوەن ماڵ گوێی لێبێ دەیگوت فلانەکەس، لە بیرتە لەبەری قەڵاسێوکە وشوان وشێخ بزێنی کابرایەک دەعوەتی کردبووم چایەی تەئخیر هێنا منیش ڕاست کوشتم، کابرای خاوەن ماڵ ودەعوەت مشەوەش دەبوو یەکسەر چای دەهێنا، دەبووە پێکەنین .

## ڕازی دەبی

٦٦. د.فوئاد مەعسوم یەکەم سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، دوایی بووە لێپرسراوی ناوەندی لە دەرەوە کۆنفراسێک هەبوو لە هۆڵەندا، مام ڕۆستەم وبرایم جەلال لە ئەڵمانیاوە هاتنە هۆڵەندا بۆ بەشداربوون لە کۆنفرانسەکە، جا لە دانیشتنێک پێش کونفراس لە شاری (ئەنیش خەدێ)، برایم جەلال گوتی (ی.ن.ک) و سەرکردایەتی ڕێزی کادیری خۆیان ناگرن وکاریان نادەنێ بۆیە ناگەڕێنەوە، لە دەرەوە دەمێنەوە د.فوئاد مەعسوم گوتی ئەوانەی لە دەرەوە دەگەڕێنەوە بە هەموو ئیشێک ڕازی نابن وخەڵکیش هاتۆتە پێش، گەشەی کردووە، برایم جەلال گوتی وانییە وگفتوگۆیەکی پڕ گلەیی زۆری کرد، سەرەنجام د.فوئاد گوتی کاک برایم جەلال جەنابت ڕازی دەبی بتکەینە قایمقام، برایم جەلالیش ئەوپلەیەی پێ کەم بوو بە توورەیی گوتی: د.فوئاد جەنابت ڕازی دەبی بتکەنە مدیر ناحیە، بووە پێکەنین چونکە د.فوئاد سەرۆک ئەنجومەنی وەزیران بوو!

## فەنی!!

٦٧. شێخ عومەری ئیدارە لە ئیدارەی گشتی کاری دەکرد، مام جەلال چاودێری وسەرپەرشتی دەکرد، بەیانییەک مام جەلال لە باخەوانێک توورە دەبێت، شێخ عومەریش نەهاتووە، لە ناکاو شێخ عومەر پەیدا دەبێ، دەزانێ مام جەلال توورەیە، مام جەلال

دەڵێ ها لە کوێ بووی ئەفەنی!! شێخ عومەریش دەڵێ فەنی نیم ئیداریم! مام جەلال دەڵێ: ئەفەندی ئەفەندی، فەنی چی!!

## سەیدی چییە !!

٦٨. بایزاغای دزەیی وحاجی موسلیح وسامی سەرپان وسەید برایم وعەبدول ڕەحمانی ئاوبارە و ئازاد دڵزار وباوکی زەعیم عەلی و باوکی ئازاد بەرواری هەمووی بەند کرابوون لەسەر ئەوەی کەس وکاریان پێشمەرگەیە چ برا چ کوڕ چ باوک لە ساڵی ١٩٨١. ئەو دەم حزبی بەعس باوک ودایکی پێشمەرگە دەگرت گەر پێشمەرگەی بوونایە، جا سەید برایم لە بەندیخانە لەگەڵ گرووپێک لەسەر پاکەت کاغەزە کۆنکانیان دروست کردبوو لە بەندیخانە، هەندێکیان کۆنکانیان دەکرد، حاجی موسلیح باوکی عەولا بۆر هەمیشە خەریکی نوێژ و لە خوا پاڕانەوە بوو، بەیانییەک دەستی سەید برایم ماچ دەکات دەڵێ عەفووم کە، سەید برایمیش نازانێ مەسەلە چییە، حاجی موسلیح گەرەوانی دەڵێ کفرم کرد وباسی سەیدانم کردووەو من گوتم ئەرێ ئەوە سەیدی چییە ڕۆژ تا ئێوارە خەریکی کۆنکانە خەویشم دیوە، لە خەوما سەیدی بچکۆلە ویستوویانە بم خنکێنن بۆیە عەفوم کە، ئیدی بەندییەکان دەست دەکەن بەپێکەنین.

## ڕاگوێزان

٦٩. لە سەرەتای شۆڕشی نوێ حکومەتی ڕژێمی بەعس گوندەکانی سەر سنوری ڕاگوێزا، لەو کوردستانە خۆش وئاو وهەوا سازگارە هێنانیە ئۆردوگاکان، مەلا ئەنوەری مەنتک ئەو چەند دێرەی هەڵبەستبوو:

**دونیا بوو بە تەشریعی و تەنفیـــــزی**
**خەڵکیان هێنا خوار لە بن دار گیـزی**
**پێیان دەرخوارد دان ڕوونی گیـــزی**
**بە تورک و عەرەب ڕووس و ئینگلیزی**
**داخەکەم کوردیان وا (کا) بە حیـزی**

## بەچ سیفەتێ دەناسرێ کۆیی

٧٠. لە پاش ڕاپـەریـن لە هەولێر مامۆستا بەکر وڕێباز وسەفین مەلا قەرە و ڕەهبەر سەید برایم پێکەوە بوون، هەر چواریان فەرماندەی پێشمەرگە بوون، مام جەلال دێتە هەولێر هەر چوار فەرماندە دەچنە لای پێشوازییان لێ دەکات بەڵام لوتف ومجامەلەی ڕەهبەر سەید برایم لـەوان زیاتر دەکات، سەفین مەلاقەرە دەڵێ: ئەوە کۆییاتی و خۆیاتییە، بۆیە مام جەلال لوتفی زیاتر دەداتە ڕەهبەر سەید برایم چونکە کۆییە وخەڵکی یەک شارن و ڕەهبەر سەید برایمیش دەڵێ: لە کۆیە شاعیرێک هەیە بەناوی ڕۆستەم حەویزی ئەو شیعرەی داناوە:

**به چ سیفەتێ دەنـاسرێ کۆیی**
**بێگانەی دەوێ زیاتر لە خۆیی**

سەفین دەڵێ بەخوای، ئەمە شیعری ڕۆستەم حەویزی نییە، ڕەهبەر سەید برایم لە خۆی دایناوە!!

## ئامین و ئاڵتون

٧١. لە دێی کاولەسواری شێخ بزێنی خواروو، مام ئەحمەد نـەزری لە خۆی گرتبوو، دەیویست مەولودێ بکات لە ساڵی ١٩٨٣، چەند گاو گوێرەکەی سەر بڕیبوو، کەچی مەلا دەست نەکەوتبوو مەولودەکەی بۆ بخوێنێ چەند دێیەکی دەوروبەری گـەڕابوو، مـەلا شاخی کـادیری کۆمەڵە ومارکسی بـوو، لەو ناوە بوو، مام ئەحمەد دەگریا لە داخـان دەیگوت ئەو هەموو خەسارەتەم داوە کەچی مەلام دەست ناکەوێ، مەلا شاخی دەڵێ کەی کێشەیە من مەولودەکەت بۆ دەخوێنم ومام ئەحمەد دوو ژنی هەبوو بە ناوی ئامین و ئاڵتون، ئیدی مەلا شاخی بەڕێک وپێکی مەولودەکە تەواو دەکات، لە کۆتایی هەموو دوعادەکەن ڕوو لە ئاسمان دەکەن، مام ئەحمەد یەک بەخۆی هاوار دەکات دەڵێ ئامین، مەلا شاخی دەڵێ ئەرێ مام ئەحمەد دوای دوعایەکان هەر دەڵێ ئامین جارێک ناڵێ ئاڵتوون، ژنەکەی ئاڵتون دێتە وەلام دەڵێ وەلا ڕاست دەکەیت هەر دەڵێ ئامین جارێک ناڵێ ئاڵتون!!

## هەڵپەڕین

٧٢. مەلا شاخی وکۆچەر عەبدوڵلا وشێخ فەتاحی کاولان هەر سێکیان کادیری کۆمەڵە بوون، مەلا شاخی خەڵکی شەوگێڕی شێخ بزێنیی خواروو بوو، مەلا شاخی دەگوازرێتەوە بۆ بەری خاڵخاڵان ساڵی ١٩٨٦، دەیەوێ دەوروتەسلیم بکات دێبەدێ دەگەڕێن ڕێکخستنەکان بناسێ، ڕادیۆی بەغدا دەکەنەوە گوێ ڕادەگرن، کۆچەرێ کۆچەرێ دەڵێ، شێخ فەتاح ومەلا شاخی هەڵدەپەڕن چەقەنە لێدەدەن، کۆچەریش دەوەستێ، دوای کۆچەرێ بە ڕێکەوت میدیا حسێن گۆرانی شێخ فەتاح شێخ محێدین دەڵێ، کۆچەر ومەلا شاخی هەڵدەپەڕن ودەست بە چەقەنە لێدان دەکەن، شێخ فەتاح تەماشایان دەکات هەر بە ڕێکەوت دوای ئەوە محمدی سەفایی گۆرانی کچی مەلای دەڵێ ئەوجا کۆچەر وشێخ فەتاح بۆی هەڵدەپەڕن ودەست دەکەن بە پێکەنین.

## ناو جاسوسەکان

٧٣. شێخ جەلالی بێدەری کادیری شۆڕشگێڕان بوو لە بەری خاڵخاڵان ساڵی ١٩٨١، زۆربەی پێشمەرگە وخەڵک کۆمەڵە بوون، شێخ جەلال هێندەی ئازار دیبوو لە دەست کۆمەڵە، ئەو دەم (ی.ن.ک) دوو باڵ بوو، کۆمەڵە وشۆڕشگێڕان، بەلام کۆمەڵە زۆر زاڵ بوو، زۆرتر و بەهێزتر بوون، شێخ جەلال لەترسی

برادەرانی کۆمەڵە ناوی ڕێکخستنەکانی شۆڕشگێڕانی نوسیبوو، ناوی جاسوس و خائینەکانی شوان وشێخ بزێنی وقەڵا سێوکە، بەحساب گەر بگیرێن تووشی کێشە نەبن!

## نەیبوو

٧٤. شاعیرێکی هەست ناسک وخەیاڵ قووڵ نێردرا بۆ هەندەران، لەوێ دەچێتە کن هاورێیەکی، ئەویش بۆ خۆشی وپشوو ئافرەتێکی بۆ پەیدا دەکات، ئیدی بەیانی لێیان دەپرسێت کەش و هەوایەکی ڕۆمانسییانە وشاعیرانەتان هەبوو خۆش بوو، تومەز هیچیان نەکردبوو ژنەکە خۆی بۆ ڕووت کردبۆوە، شاعیرەکە دەڵێ چمان نەکرد چونکە مەمکی نەبوو، ژنەکەش دەڵێ نەوەڵا ئەو کێری نەبوو!!

## دووبارە

٧٥. ئەحمەدی حەمە خێلی پیاوێکی دڵسۆز وکورد پەروەر بوو، هەر جارەی بۆنەیەک هەبوایە لە بۆنە سیاسییەکان پارچە شیعرێکی نیشتمانی بە هوتاف دەخوێندەوە ساڵی ١٩٧٢، جارێک لە کۆیە پارچە شیعرێکی دەخوێندەوە، لە پشتەوە هەر هاواریان دەکرد دووبـارە، جارێک نەبوو، دوو جار نەبوو، سێ جار نەبوو، هەر هاواریان دەکرد دووبارە دووبارە، لەتام دەرچوو، بەهیلاک چوو هەندەی ئەو پارچە شیعرە بڵێتەوە، بۆیە مامۆستا.

عەبدولرەزاقی برای لەوێ بوو، هەستا گوتی: گەر بەراستتانە سوپاستان دەکەم گەر بە قەشمەریشتانە لە قوزی خوشک وداکتان بەم، ڕووی لە خەڵکەکە کرد ئەوانەی هاواریان دەکرد چەندان جار دووبارە.

## هەموو ڕۆژێ دەڕوخێ

٧٦. فەرهاد ڕەسوڵ گورون ناسراو بە حاکم فەرهاد بێژەر بوو، لە ئێستگەی دەنگی کوردستان و لەلای مام جەلال بوو، ئەحمەدی دادیش هەر لەوێبوو ساڵی ١٩٨٠ گفتوگۆ لەگەڵ میری هاتە ئاراوە، کۆبونەوەکرا لەبن دارگوێزێکی تۆژەڵە مام جەلال کۆبونەوەی پێکردن، لەسەر ئەوەی ئایا گفتوگۆ بکەن یان نا! ئەو باس وخواسەیان بۆ ئەحمەدی دادی گێڕابووەوە و، پێیان گووتبوو مفاوەزات سەری دەگرت حاکم فەرهاد نەیهێشت وموعاریز بوو موفاوەزات ڕەفز کرایەوە، ئەحمەدی دادی گڕی گرت، چۆن حاکم فەرهادی ڕوخاو ئەو قسەیەی کردووە، هەموو ڕۆژێ دەرووخێ، من کۆڵەگەی لەبن دەنێم تا نەروخێ ڕازیش نییە موفاوەزات بکرێ!!

## لەبرسان

٧٧. سالانی شۆڕشی نوێ، بارو ژیان وگوزەرانی بنکە وبارەگاکانی سەرکردایەتی لە خڕێ نێرزەنگ وتۆژەڵە وزەڵێ

وشێنی گەلەک سەخت بوو، بێ نان ودەرامەت بوون، دەبوو یەک نان بخورێت، وگوزەران زۆر دەگمەن بوو، هەر برنجی سوور بوو، ناونرابوو (گڕدار) بە تایبەتی پێش شەڕی عێراق وئێران (ف) هەبوو دەیگوت مام جەلال گەر پێشمەرگەت پێ بە خێو ناکرێ بۆ شۆڕشت هەڵگیرساند؟ چا خۆی نەگرت خۆی ڕادەست حکومەت کردەوە، گوتی بە خوا وبە کوردستان کە دەچمەوە ناو حکومەت لە برسانە نەک لە ترسان!!

## جیاوازییان نییە

٧٨. کوێخا حەسەنی زێوە، کوڕەکەی دەبێتە کۆمەڵەی مارکسی لینینی، لەناو ڕیزەکانی (ی.ن.ک) ئەویش دەزانێ شیوعی ومارکس ولینینین پێی خۆش نابێ، بۆیە لەیەکێک دەپرسێت ئایا سەگ و تاژی جیاوازییان چییە مەبەستی کۆمەڵە و شیوعی جیاوازییان چییە.

## هەر بە وشکی

٧٩. شێخ سدیقی کاپیلۆن لە گومرگی هەرزنە بوو ساڵی ١٩٨٤، باس وخواسی گفتوگۆ لەگەڵ میری دێتە ئاراوە، هەندێ کەس ئەو سەردەمە بەر هەڵست بوون گفتوگۆ بکرێ، شێخ سدیق لە یەکێ لەو بەر هەڵستکارانە دەپرسێت بۆچی ڕازی نی گفتوگۆ بکرێ؟ کابرای بەر هەڵستکار دەڵێ سور دەزانم گفتوگۆ لەگەڵ میری سەر ناگرێ، دیسانەوە دەگەڕێنەوە شاخ وشەڕ دەبێتەوە،

لە ئێستاوە لە شاخ ڕاھاتووین بۆ فێرە شار بین، شێخ سدیق گوتی با ئەمجارە گفتوگۆ بکرێ لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، دەستم لە ئاو وکارەبا وخۆشی شار گیر ببێ، شەرتبێ ھەر کەسێ بێتن لە شارەوە بڵێ با بچینەوە شاخی ھەر بەوشکی دەیگێم!!

## ئەمریکا شیوعیەت قبوڵ ناکا

٨٠. سەرۆکی حزبەکان (مام جەلال + مسعود بارزانی + د.کمال شاکر) بە ھەلیکۆپتەرێکی ئەمریکی لە کوردستانەوە دەچنە بەغدا بۆ مەسەلەی کورد، د.کەمال شاکر سکرتێری حزبی شیوعی کوردستان قاتێکی جوان وخاوێن ونوێی لەبەر کردبوو، کونێک لە ھەلیکۆپەرەکەوە ھەبوو، بە ئاسمانەوە بوون لە ناکاو لەو کونەوە گریز و ڕونێکی ڕەش ھەڵڕژا، کەوتە سەر جلکە جوان و نوێیەکانی د.کەمال شاکری کۆمەنیست، لەناو کۆپتەرەکە دەیکەنە پێکەنین، مسعود بارزانی دەڵێ: ھەلیکۆپتەرە ئەمریکییەکە شیوعیەت قبووڵ ناکا!

## دەزانن چەند قلە نۆکان دەخۆم!

٨١. مام ڕۆستەم کەرکوکی لەوەتی ھەیە پێشمەرگەیە، ھێندە ھەستیار ودژە بەرامبەر ڕاپۆرتی کادیران و گەیاندنی دەنگوباس وزانیاری لەسەر کەسەکان، دەزگای زانیاری سەر بە (ی.ن.ک) بوو، دەیگوت ھەر خەریکی ئێمەن ودەنگوباسمان لەسەر کۆ

دەکەنەوە وچاودێریمان دەکەن!دەیگوت کە دەخۆمەوە دەزگای زانیاری دەزانی چەند قلە نۆکان دەخۆم بەلام نازانن مەلا مستەفای بارزانی چەند کوڕی هەیە!!

## کەم بژی وکەڵ بژی

٨٢. مامۆستایەکی کچ ئەندامی( ی.ن.ک) شوو بە وەزیرێکی(پ.د.ک) دەکات، هەڤالانی کۆمیتە دەیانەوێ پەشیمانی بکەنەوە سالی ١٩٩٣، دەڵێن تۆ مامۆستا وتازە پێدەگەی، تەمەنت بچووکە، ئەو کابرا پارتییە مندالی لەتۆ گەورەترە، ئەندامی یەکێتی وچۆن شووی پێدەکەی؟ ڕەنگە(٥) سالی تر بمرێ باوەزیریش بێ، کچەکە دەڵێ شووی هەر پێدەکەم با (٥) ساڵ بەخۆشی بژیم با بمرێ! یەک لەو ئەندام کۆمیتانە دەڵێ کە وابێ کەم بژی وکەڵ بژی.

## بایەکی دیکەی ماوە!

٨٣. لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلول سێ سەرکردە وفەرماندە لە (قورتە لاس) دەبن لە ئەشکەوتێک سالی ١٩٦٣، لە پڕ کەسێک لەوان بایەکی لێبەر دەبێ،حاجی کاکۆل لەوێبووە گوتویەتی وەللا هەقی کوردتان وەرگرت، یەک لە سەرکردەکان دەڵێ هەقی کوردی هەر وەردەگرین، زەمان ڕۆیی وهات بەیانی ١١ی ئاداری بەسەردا هات، یەک لەو سەرکردانە پلەیەکی گەورەی حکومەتی

دەدرێتێ، حاجی کاکۆل دەچێتە سەردانی وئەو ڕووداوەی ئەشکەوتی قورتە لاس دەگێڕتەوە، بۆ کابرای مەسئول، دەڵێ نەمگووت هەقی کوردی هەر وەردەگرین، ئەوا ئۆتۆنۆمیمان وەرگرت وبووینە کار بەدەستی گەورە، حاجی کاکۆڵیش دەڵێ: بەخوا بایەکی دیکەی ماوە.

## ئەحمەد شێواو

٨٤. پاش ڕاپەرین بەرەی کوردستانی کەوتبووە گەڕ، لەوێ ڕێکخراوی (کلای) کەلوپەل وئازوقەی دابەش دەکرد، جەمال مەرگەیی ئەو کارەی پێدرا بوو دابەشی بکات، ئەحمەد شێواوی شاعیریش پیاوێکی هەژار ودەست کورت بوو، زۆر ماندوو بوو هەر وەستا بوو بەری نەکەوتبوو، چی دەست نەکەوتبوو، داوای کرد بەرزی بکەنەوە، بەرزیان کردەوە لەسەر شانی خەڵک بوو هاواری کرد:

**جەمالی عەوڵای مـــــەرگێ**
**ئەوەی کردت بە کونی قنگێ**
**بۆ ناچیەوە سێوکـــــــانێ**
**ئەوێ خۆشترە بۆ دانـــــێ**

## باوکی سەردارە!!

٨٥ مەفرەزەیەکی هاوبەش لە حزبی سۆشیالستی کوردستان وپارتی دیموکراتی کوردستان لەناو چەم و گوڵە بەرۆژەکانی دەشتی شارەزوور خۆیان شاردبووە ساڵی ١٩٨٢، ئیتر خشەخشەک دێت وا دەزانن جەیش وجاش هاتونەتە سەریان وئاشکرا بوون بۆیە یوسفە لچە چاودێری دەکات دەیەوێ بزانن چییە، دەبینێ (بەرازەکە) ئەو بەزمە ومشەوەشییەی دروست کردووە، بۆیە یوسفی لچە بە عوسمانی قالە منەوەر (خاڵە عەفان) دەڵێ: هیچ نییە باوکی سەرداری قالە بەرازە، هاتووە بۆ ئەو ناوە دەست نوێژ بشوات!

## بابمرێ ئەو حەسودە

٨٦ پێش ڕاپەڕین بەرنامەڕێژی بۆ ڕاپەڕین دەکرا مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان تەشریفی هاتە قاسمە ڕەش بارەگا وبنکەی سەرکردایەتی (ی.ن.ک) کۆبوونەوە کرا ناونرا کۆبونەودی (ئەگەرەکان) ساڵی ١٩٩٠ کۆمەڵە برادەرێک لە پێشوازیدا بوون بەخۆشی دەیانگوت:

**لێدەن لەو چەنگ وعودە**
**بۆ هاتنی مەســـــــعودە**
**بابمرێ ئەو حەســـــوودە**

حەسوود مەبەست لە سەدام حوسێن بوو!

## تەنەکە نەوتەکەی دەدەمێ

٨٧. ساڵی ١٩٧٤ شەڕ بووە، تۆپ باران و هێرش وبۆردومانی فرۆکە و ناخۆشی و شەڕی لێ کەوتەوە، پیرەژنێک لە گوندی (ناوەندە) ی باڵەکایەتی پرسی ئەرێ مەلا مستەفا بارزانی چی دەوێ ئەو شەڕ وئاژاوە هەیە، ئەوانیش گوتیان (نەوت) پیرەژنیش گوتی هەر لەبەر نەوت؟ گوتیان ئەرێ وەڵڵا پیرەژن گوتی: من تەنەکە نەوتەکەی دەدەمە مەلا مستەفا با ئەو شەڕ و ئاژاوە ببڕێنێتەوە!!

## مفە حەیاتەکە

٨٨. ساڵی ١٩٧٨ هەمزاغا باپیراغای پشدەرێ هاتبوو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ (ی.ن.ک) ئەوسا بە گفتوگۆ (موفاوەزات)یان دەگوت (مفە حەیاتەکە) جا هەندێ پێشمەرگە وکادیر لە قەندیل دەیانگوت:

**ئۆخەی هەمزاغا هاتەوە**
**بەخۆشی وخێراتـــــەوە**
**هەمزاغـــــــــای ورگن**
**نەرمۆڵــــــــــە وخرپن!**

## عەبدولرەحمان گۆمەشینی

٨٩ـ عەبدولرەحمان گۆمەشینی پیاوێکی پاک وەک پەپوولە بوو بێ غەلوغەش کوردایەتی دەکرد، ببووە لێپرسراوی ئیدارەی م.س (ی.ن.ک) لە هەولێر، وێنەیەکی خۆی ومام جەلالی هەڵواسیبوو لە پشت مێزەکەی پێکەوە گرتبوویان، نەیدەزانی کامە خۆیەتی، کامە مام جەلالە، جارێک فاروق جەبار تەلەفۆنی بۆ دەکات، دەڵێ جەنابت کێی؟ فاروق جەبار دەڵێ: عەبدولرەحمان گۆمەشینیم، عەبدولرەحمان گۆمەشینیش دەڵێ: هۆی دەنا ئەمنیش عەبدولرەحمان گۆمەشینیم، لە ٣١ ی ئاب لە هەولێر، لەسەر یەکێتی گیرابوو، ئازادیان کردبوو، ئەوسا فەرەنسۆ حەریری لێپرسراوی لقی دوو بوو لە پارتی، تۆقەی لەگەڵ دەکات دەڵێت زۆر سوپاس کاک کۆسرەت ئەویش م.س یەکێتی بوو، جارێک پێی ڕادەگەیەنن کەوا وەفیق سامرایی دێت دەرگای گەورەی بۆ بکەنەوە، لە پڕ مامۆستا نازم دەباغ بەو دەرگایەدا دێت، عەبدولرەحمان گۆمەشینی بە عەرەبی قسەی لەگەڵ دەکات و ڕێزی لێدەگرێ پێشوازییەکی گەرمی دەکات، مامۆستا نازم دەڵێ: کاک عەبدولرەحمان گۆمەشینی خێرە بەو دەم ودەستە بە عەرەبی قسەم لەگەڵ دەکەیت!! ئەویش دەڵێ: خۆچما ڕەفیق سامەڕایی نی وای زانیبوو مامۆستا نازم، وەفیق سامەڕایی یە.

## ڕاوەستان بۆ شەهیدان

.٩٠ عەلی گـەدە لە تیپی ٢٥ ی خاڵخالآن بـوو لە هێزی (ی.ن.ک) جارێک کۆبونەوە بە پێشمەرگەکانی دەکـات وەکو دەستپێک دەڵێ نیو سەعات هەستان بۆ گیانی پاکی شەهیدان، پێشمەرگەکان هاوار دەکەن بۆ نیوسعات زۆرە، مەعقولە نیو سەعات ڕاوەستان عەلی گەدە دەڵێ (ی.ن.ک) شەهیدی زۆرە دەبێ بوەستین، جارێکی دیکە لە گوندی کانی بی دەشتی کۆیە کۆبونەوە بە تیپی ٩٣ ی کۆیە دەکرێ سەباح عبدالقادر و (سێوە قۆڕ)، لەو کۆبونەوە دەبن، لێپرسراوەکە دەڵێ: یەک دەقە وەستان بۆ گیانی شەهیدان سێوە قۆریش دەڵێ تکایە نیو دەقـەش بۆ برینداران.

## بۆ من وانیم

.٩١ داود پ.م بوو لای جەمالاغای حەکیماغا لەناوەندی بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان ساڵی ١٩٨١، ئەندامێکی م.س (ی.ن.ک) هەبوو هێندە بە هـەواو بەفیز بـوو، لووتی لە ئاسمان بوو، ئەوجا داود دەیگووت باشە لەو شاخ وداخە، لوت بـەرزی بۆچییە! ئەو بـرادەرە بۆ وا رووح گەورەیە! وەک من دەمی هەیە پێی دەخوات، وەک من قینگی هەیە گووی پێدەکات! باشە بۆ من فیزم نییە بۆ ئەو هەیەتی!

## گووز

٩٢. گوێز لە هەورامان پێی دەڵێن (وەزی) لە هەولێر پێی دەڵێن (گیز) لە کۆیە پێی دەڵێن (گووز) جا کادیرێکی کۆیی بنە گونیەک گوێزی پێ دەبێت، لە زاڵگەی ناو ئێران سەر سنوور لەسەر دەشت پاسداران پێی دەڵێن ئەوە چییە؟ ئەویش گوتبووی (گووز) بە فارسیش واتە(تڕ) دوور لە ڕووتان! پاسدارەکانی زاڵگە وا دەزانن تەقەمەنیە کشابوونەوە، دوایی زانییان پێکەنی بوون!

## بۆ خۆت وای

٩٣. لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان مەسیحی پێشمەرگە بوون سەرەتا سولاقە، هەبووە دەیانگوت سولاقە، چەکی شانی یەک لاقە، لەتیپی ٩٣ ی کۆیە (هاوێل شەعیە مەڕبێن) پ.م بوو، جارێک مام شەعیەی دیان دێتە کن هاوێلی کوڕی تەسلیمی بکاتەوە، هاوێلیش دەڵێ کوردم و پێشمەرگەم تەسلیم نابمەوە، مام شەعیەش دەپاڕایەوە، دەیگوت تووشی کێشەمان مەکە، گوشار وفشارم لەسەرە، قاسماغا ناردوومی دەبێ تەسلیم ببیەوە هاوێلیش گوتی: قاسماغا ئەو گەورە خائینە کەی پیاوە جاشە، ڕوو ڕەشە، گەوادە جنێوی دا، مام شەعیەش لەترسان بە هاوێلی دەگوت: تۆ سەگبابی، تۆ هیچ وپووچی چۆن جنێو بە قاسماغای دەدەی، هەندێ پ.م لەوێ بوون وایدەزانی دەیگێڕنەوە، هاوێل تەسلیم نەبۆوە، مام شەعیە خۆی بووراندەوە لە ترسان.

## (٦٦)

٩٤. قارەمان حەمەد ئەمین حەمەد ناسراو بە قارەمان تیماری خەڵکی هەولێر و لە تیپی ٩١ ی سەفین لە ڕیزەکانی (ی.ن.ک) پ.م بووە چوار جاران بریندار بووە، سەرەنجام چۆتە ئەمریکا لە واشنتۆن لێپرسراوی کۆمیتەی پێشمەرگە دێرینەکان بوو لە ئەمریکا ١٧٠ پ.م ی دێرین لە ئەمریکا هەن بە فەرمی ناسنامەیان هەبوو، ساڵی ٢٠٠١ مام جەلال دەچێتە ئەمریکا قارەمان تیماری لەخزمەتیدا دەبێ، بە ڕێگای highway٦٦دا دەیبات هەر بە exzit٦٦دا دەچن، جادەی گشتی فرجینیاو واشنتۆن ناوی (٦٦) ە تابلۆی لێدراوە، دەگەنەوە ماڵی مام جەلال لە قارەمان تیماری دەپرسێت موالید چەندی!

قارەمان تیماری بەشەرمەوە دەڵێ(٦٦)، مام جەلال دەڵێ دوو جار بە ڕێگای (٦٦) شتدا هێنام ئەو هەموو(٦٦)ە چی بوو لەمن کۆبوونەوە!!

## عەولای کەوەرتییان

٩٥. لە تیپی ٩١ی سەفین کابرایەکی شوان وبیرکۆل وکلۆل وبێ ئاگا هەبوو ناوی (عەولا) بوو خەڵکی کەوەرتییانی خۆشناوەتی بوو، چی نەدەزانی کردیان بە پ.م هەندێک ناڕازی بوون بکرێ بە پ.م، بەلام سەرەنجام دەیکەنە پ.م کەپێی بگەیەنن، چی نەریت بوو تەیارە وهەلی کۆپتەری دەگوت (بزن ژمێر) وای

دەزانی بزنەکانی دەژمێری، یەکەم جار بوو تەلەفزیۆن ببینێ پێشمەرگەکانی گوتیان ئەها ئەوە (سەدام )ە عەولاش دەپرسێت سەدام چییە پێشمەرگەکانیش دەڵێن خواردنە وەک ساوار و یاپراخ، عەولاش دەڵێ شەرت بێ قەت نەمخواردووە!!

## خەوم لێ نەدەکەوت

٩٦. ساڵی ١٩٨٦ مام غەفوور سەرتیپی ٨٧ ی قەرەچووغ دەبێ لە شەڕ وداستانێکدا لە چیای سەفین پێشمەرگەیەک لە خەلفی پاسەوان بوو شەوێ لە ئێشکگری خەوی لێکەوتبوو، ئێشکی نەگرتبوو، لێی نوستبوو، دوایی مام غەفوور بانگی دەکات ولێی دەپێچێتەوە ئاخر چۆن خەوتووی ئێشکگریت نەگرتووە، لێی دەپرسێت تەمەنت چەندە؟ پێشمەرگەش دەڵێ (٢١) ساڵ مام غەفوور گوتبووی بە ٢١ ساڵی خەوت لێکەوتووە وخەوتووی ئاگات لێنەبووە. کەچی من لە تەمەنی ٢١ ساڵی لەبەر کێرم خەوم هەر لێنەدەکەوت!!

## چەک وقەڵەم

٩٧. مام جەلال سکرتێری گشتی ( ی.ن.ک ) لە هەندەران دەگەڕێتەوە، هەر فەرماندەی پێشمەرگەیەک قەڵەمی بە دیاری بۆ هێنا بوون، یوسف زۆزانی کادیر ورەوشەنبیر لە ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک) کاری دەکرد، پێی سەیر بوو مام جەلال قەڵەم بە دیاری

دەداتە فەرماندە پێشمەرگەکان، ئەویش ڕاگەیاندکار وخاوەن قەڵەم ونووسەرە، قەڵەمی بۆ نەهێنا بوو، دەچێتە لای مام جەلال دەڵێ هاتووم دۆشکەیەک، ڕەشاشێک، چەکێکم بدەیتێ، مام جەلال دەڵێ تۆ نووسەری تۆ راگەیاندنکاری چ ئیشێک بە چەکە؟ دەڵێ ئەدی فەرماندە عەسکەرییەکان قەڵەمیان بۆ چییە! منیش بەپێچەوانەوە داوای چەک دەکەم!!

## قادر گۆزێ

٩٨. قادر حەمەدەمین قادر بەکر خەڵکی شەقڵاوە ناسراو بە (قادر گۆزێ) دەبێت گوێزیان زۆر بووبێ بۆیە ناونراون (گۆزێ) نازناوەکەیان لە گوێزەوە هاتووە، قادر گۆزێ کوردپەروەر وپاک وبێگەرد ودڵسۆزی کورد وکوردایەتی بوو، خۆی وکوڕەکانی هەر خەبات وپێشمەرگایەتی وکوردایەتییان کردووە، قادر گۆزێ لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە پێشمەرگە بووە، چەکی شەرەفی لەشان کردووە، تا لە ئەمریکا کۆچی دوایی کرد ووازی لە کوردایەتی نەهێنا وهەر تێکۆشەر وگیانی شۆڕشگێڕانەی بە جۆشتر بوو، لە شۆڕشی ئەیلوول هەندێ کەس بوونە جاش، لە شەقڵاوە دەیانگووت (مەن ڕەبووکە، سێنزدە دینار و ڕوبعەکە) قادر گۆزێش بەو چوار خشتەکیە وەڵامی دابوونەوە:

**ڕادەبوێرم ڕووت وبرســی**
**گوێ نادەمە هیچ مەترسی**

**کورد نافرۆشم بە فلووسی**
**مێژوو ئەمانە دەنووســی!**

## بژی بابی ئومێدی

٩٩. مامۆستا ئەنوەر زبێر سلێمان بادینی بوو خەڵکی زاخۆ بوو بە مامۆستایەتی هاتبووە کۆیە سەرەنجام لە کۆیە ژنی هێناو بووە زاوای کۆییان، وانەی عەرەبی بە قوتابییانی ناوەندی ودواناوەندی دەگوتەوە، خۆی دەرچووی شەریعە بوو بەڵام ملی دابووە خواردنەوەی مەی ودەیگوت من شـارەزای شەریعەتم تێی دەگەم. دوو کوڕ و سێ کچی هەبوو یەک لە کوڕەکانی ناو ئومێد بوو بەو دروشمە تووڕە دەبوو:

**بژی بابـی ئومێدی**
**ئامیر هێزی ئامێدی**

## نهێنی بە ئاشکرا

١٠٠. مام ساڵحی گۆر ئەسپ جێگر تیپی ٥١ ی گەرمیان بوو لە یەکەکانی (ی.ن.ک) ساڵی ١٩٨٤ مەفرەزەیەک تووشی شەڕ دەبن لەگەڵ مام ساڵح گۆر ئەسپ بە جیهازی هۆکی تۆکی قسە دەکەن، پێشمەرگەکانی دەڵێن وەزعمان زۆر باشە ودیل ودەستکەوتمان هەیە، چەندان کوژراویان هەیە سەرکەوتوین بەڵام گەر وابڕوا فیشەک وتەقەمەنیمان پێ نامێنێ بۆیە فیشەکی

b.k.c و گوللەr.b.g یمان بۆ بنێرن، مام ساڵح دەڵی هێواش هێواش چۆن قسەی وادەکەن، لەسەر جیهاز با دوژمن نەزانێ وئـەوە سێ مانگە دەرزی دۆشکەمان شکاوە، تەقە ناکا هەر باسیش ناکەین با دوژمن پێ نەزانێ چۆن داوای فیشەک و گوللە b.k.c دەکەن!!

## تاوڵە

١٠١. خاڵە شێخ سدیق گوێی گران بوو بوو، لە بارەگا حەزی لە تاوڵە بوو، بەس هێندە نیگەران دەبوو، کە بدۆراباو پێ توورە دەبوو. جارێک تاوڵە دەکاتن لەگەڵ پێشمەرگەیەک، شێخ سدیق زۆر شارەزاو گەمەزان بوو، لەو کاتە تۆپ باران بوو، هەشتا گوللە راجیمە بە گوندی (گەڕەدێ)وە نرابوو، شێخ سدیق وای دەزانی کابرای بەرامبەری تڕان لێدەدا، سەرەنجام شێخ سدیق دۆڕا کابرای پێشمەرگە گوتی خاڵە شێخ سدیق خۆ دۆڕای، شێخ سدیقیش گوتی ڕاستە دۆڕام بەڵام توخوا عەیب نییە ئەو هەموو تڕەت کەند، جاوەرە ترکەنێک لێت بباتەوە تومەز شێخ سدیق شرقە وگرمەی تۆپی لێ ببووە تڕ.

## دوکانەکان دامەخەن

١٠٢. لە تیپی ٢٣ی سلێمانی خەڵکی گەڕەکی عەقاری شاری سلێمانی زۆریان پێشمەرگە بوون وا ناسرا بوون شلە شارین و

بە کێک و شیر و نەستەلە گەورەبووین. پێشمەرگەی زۆر قارەمان و بە بیرو باوەڕیان لێ هەڵکەوت بوو، زۆربەیان قسەخۆش وسوعبەتچی بوون، لە ناوچەی خۆشناوەتی جەولەیان دەکرد، نەریتی ژنەکان وا بوو دەموچاوی خۆیان دادەپۆشت، بەرامبەر پیاوان کەتێ دەپەڕین چا شوانەی رەئوف نوری ئەگاتە دوو ژن ئەوانیش دەموچاویان داپۆشی، شوانە دەڵێ توخوا دەرگای دوکانەکان دامەخەن دوو پاکەت جگەرەم ئەوێت!

## زەوق هەستان

١٠٣. لە سنووری شارباژێر کێشەیەک دەبێ لەسەر سێکس (حامد حاجی غالی) دەچێتە ماڵی کوێخا بۆ چارەسەرکردنی لەگەڵ ڕیش سپی ومەلای دێ، کچەکە هێندە بە تام دەیگێڕێتەوە کە چۆن چۆنی شتی وایان لەگەڵی کردووە، یەکێک لەوێ خزمەتیان دەکات دەبینن بە کووڕە کووڕە چا دەهێنێ، تومەز لەو قسە خۆشانەی کچەکە، کابرا زەوقی هەستاوە، حامید دەڵێ هەتیو هەستە خۆت ڕاست بکەوە. هەمووی دەزانن تومەز کابرای خزمەتچی زەوقی هەستاوە داری سەیتەرەی بەرز کردۆتەوە، دەڵێ ببوورن لە ژیانم گوێم لە قسەی وا خۆش و بەتام نەبووە، بۆیە ئاگرم گرتووە زەوقم هەستاوە.

## وارێن میر گەوادە

١٠٤. لە خۆشناوەتی لە دوای گرتنی بێتواتە و وخاوێن کردنەوەی، دۆڵی خۆشناوەتی کەوتە دەست پێشمەرگە ساڵی ١٩٨٣، پێشمەرگە بازگەی دانابوو، بۆیە هەر خۆشناوێک دەهات بەوێدا، پێشمەرگەی بازگە زۆری لە ڕێبواری خۆشناو دەکرد کەوا (جنێو بە میر)بدا بۆ کابرای خۆشناو ئەستەم بوو نەی دەوێـرا جنێو بـدا بە میر، کـابـرای خۆشناویان ناچار دەکرد تەشقەڵەیان پێدەکرد و ڕێیان لێ دەگرت! لێی نەدەگەڕان، بۆیە بەناچاری دەیگوت وارێن میر گەوادە (واتە وا ئەڵێن)!!

## پشیلە و مەزەی نیسک !

١٠٥. لە ساڵی ١٩٨٢ بارو گوزەرانی پێشمەرگە هێندە سەخت و ناخۆش و پڕ برسیەتی بوو پێشمەرگە لە بارەگاکانی (خڕێ نێر زەنگ) لە پشت مامەندە بەیانییان نان و چا و نیوەڕۆیان و ئێواران نان و نیسک جا ئەگەر یەکێک بهاتبا، یان بەسەردا هاتبا، جامە ئاوێکیان زیاد دەکرد بۆ ئـەوەی بەش بکا!! خارە کەمال و هیمدادی تایەر بەگ نەختێ عارەقیان پەیدا کرد بوو بۆ خواردنەوە لە بن چادرێک، مەزەشیان هەر نیسک بوو، پشیلەیەکی لەڕ دەیمیاواند لە برسان خارە کەمال نەختێ مەستبوو بوو، قسەی لەگەڵ پشیلەکە دەکرد و دەیگوت ئاخر بۆ ناچیە ژاراوە و بەستەستێن وسەنگە سەری ئەو هەموو گۆشت وتەشرییە هەیە

پێیان ناخورێ، چی ئیشت بە ئێمە هەیە. مردین بە نیسک، چل ڕۆژە لەسەر یەک نیسک دەخۆین، نازانین تامی گۆشت و هێسک چییە، دەبڕۆ وازبهێنە با فرەک عارەق بخۆینەوە بەمەزەی نیسک! پشیلەکە وا هەڵدرووشکا بوو، وەک بڵێی گوێی لە خارە کەمال دەگرت! هیمدادی تایەر بەگی بە خارە کەمال دەڵێ بە ڕاستیتە قسە بۆ پشیلە دەکەی!!

## حەمە بەگرەز

١٠٦. حەمە بەگرەز یەکەم برینداری شۆڕشی ئەیلول بوو، بە برینداریش دووپشک پێوەی دابوو، حەمە بەگرەز خەڵکی کۆیەیە مێشک ڕوون ودەنگخۆش وهونەرمەند بوو، هەر لەگەڵ باڵی مام جەلال بووە، زیاتر عومەر دەبابەی خۆش دەویست، ساڵی ١٩٦٢ لە گوندی شیوەشان دەبن، مام جەلال وێنەی ماوتسی تۆنگ لە ئێخەدابوو، ئەو پەڕی چەپ ومارکسی بوو جا مام جەلال و عومەر دەبابە پێکەوە بوون، عومەر دەبابە هانی حەمە بەگرەزی دەدا ئەو شیعرەی بخوێنتەوە مام جەلال پێ توورە دەبوو:

**لە کۆیەوە ڕا هەتا کو پـــــــەکین**
**لەعنەت لە بابی مارکس و لینـــــین**
**هەرچی حەز دەکا شیوعیەت سەرکەوێ**
**سەد هەزار کالیار بەگیـــــانی کەوێ**
**فەهد وا تۆپی چوو بۆ جەهـــــەنەم**

**هەر هاوار دەکا لە بەحری حـــەوتەم**
**ئەڵێ هەر خۆش بێ مارکسی و لینـــین**
**حەیا و ئابڕووی چوو لەسەر ڕووی زەمین**

## ئەگەر شۆڕش سەرکەوت

١٠٧. ساڵی ١٩٦٢ بارەگای مام جەلال لەشیوەشانی دەشتی کۆیە بوو لەگەڵ عومەر دەبابە و د.خالید، حەمە بەگرەز وکەریم سلیم هەموویان لەوێ بوون، مام جەلال کراسەکەی چڵکن بوو پڕ لە ڕشک و ئەسپێ بوو، دابووی بە حەمە بەگرەز وکەریم سەلیم بۆی بشۆن، ئەوانیش ڕاست سوتاند بوویان، گوتیان مام جەلال تایتمان لە کوێ بوو بە پەلکە هەنجیر قاپان دەشۆرین بۆیە سوتاندمان، خاوێن نەدە بۆوە پڕ لە ڕشک و ئەسپێ بوو، مام جەلال لە حەمە بەگرەز دەپرسێت کورد ئەگەر سەرکەوێ من وعومەر دەبابە و د.خالید وتۆ دەبینە چی حەمە بەگرەز دەڵێ: مام جەلال ئەتوو زۆر لە تەپڵی سەرێ دەبی، کاک عومەر دەبابە دەبێتە رەئیس محکەمەی عولیا، د.خالید دەیکەنە دکتۆرێکی گەورە، منیش شەهادەی چواری سماقوڵیم هەیە دەبمە فەڕاشی موسەقەف!

دەست دەکەن بە پێکەنین!.

## مەحکەمە

١٠٨. ساڵی ١٩٦٢ لە شیوەشان هەندێک هەبوون پێیان دەگووتن ئەنسارولسەلام، حەمید باتاسی یەک لەوان بوو، حەمە بەگرەز پێیان دەڵێ(ئەنساری سەیان)، حەمید باتاسی نیگەران دەبێ شکات لە حەمە بەگرەز دەکات لای حاکم. ئەوسا عومەر دەبابە حاکم بووە، دەست دەکەن بە دادگایی کردنی حەمە بەگرەز، حەمە بەگرەز دەڵێ: نازانم ئەو کابرایە چۆن هاتۆتە دەرێ و بۆتە پێشمەرگە دەڵێ شەڕ ناکەم! دەڵێ لە پێناوی ئاشتیدا من شەڕ دەکەم، ئیتر عومەر دەبابە زۆر حەزی لە گۆرانی هەنارهەنار بوو دەڵێ لەمحکەمە بڕیارمان دا حەمە بەگرەز دەنگی گەلەک خۆشە هەی نار هەی نارێکی بڵێ، حەمە بەگرەز گۆرانییەکە دەڵێ. حەمید باتاسیش دەڵێ: تەڕ مەحکەمە عومەڕ دەبابە دەڵێ ئەوە حوکمە و قەرارە!! بۆ مەحکەمە چ عەیبیتی؟

## ڕێکخستن

١٠٩. چەند کەسێک لە ڕێکخستن کاریان دەکرد، ڕێکخستن لە زەمانی بەعس مەترسیدار بوو، ساڵی ١٩٨٠ باجی مەرگ و ئەشکەنجەدان و لەسێدارەدان بوو، بۆیە لە دەشتێک دادەنیشن هەر یەکەیان شوشە بیرەیان بە دەستەوە دەبێ گەر دوژمن پێ ڕاگەیشت گوایە دەخۆنەوە و بۆ سەیران چوونە لەو لاشەوە ماکەرێک دەلەوەڕا وایان دانا بوو گەر ئەمن و جاسوسەکانی بەعس هەر بڕوایان نەکرد بڵێن وەڵاهی بۆ کەر گاین لەو ناوەین!! چ پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە.

## ( نەجمەدین مەلا)

١١٠. نەجمەدین مەلای نووسەر و ڕوناکبیر و خاوەن کەشتی نوح و چرای ڕۆشنکەرەوەی شەوەزەنگی تاریکی بوو کەچی پشیلەیەکی هەبوو ناوی نا بوو (مەحمود) گوایە بە ناوی شێخ مەحمودی نەمرەوە ناوی ناوە، هەر چەند خالیسی لە شعری عیتاب بە شێخ مەحمود دەڵێ: لە کوێ دەرەقەتیان دێی پشیلەی کانی ئیسکانی ساڵی ١٩٦٢ عەبدولکەریم قاسم بۆردوومانی سلێمانی کرد نەجمەدین مەلا وتبووی:فڕی فڕی! عەبدولکەریم تڕی!!

## چۆنی دزیوە با ئەوانی دیش ئەوها بدزێ!

١١١. حاجی مەحمودی گەلاڵی قینی لە کمال عەلی وخولە کۆمەڵە وشێخ کامل وئاوات قارەمانی دەبۆوە ئەوانیش هەمووی کادیری پێشکەوتوی پاک وبە بیروباوەڕی (ی.ن.ک) بوون وایان تێگەیاندبوو کە بە قسەی ئەوان حاجی مەحمودی گەلاڵی چەک کراوە ئەو قینەی هەر لە دڵ بوو، لە هەموو جێیەک زەمی دەکردن وبوختانی بۆ هەڵدەبەستن، جارێک حاجی مەحمودی گەلاڵی لە ساڵی ١٩٨٤ لەکن مولازم عومەر دەبێ مولازم عومەر ئەندامی م.س (ی.ن.ک) ومەسئوولی مەکتەبی عەسکەری بوو هەر بۆیە بەزم وسوعبەت، مولازم عومەر بەو بەزمە دەزانێ هەر لە خۆیەوە بروسکەیەک دەخوێنێتەوە لە کەمال عەلییەوە بۆ

م.س و مولازم عومەر، شەش تەن ئازووقەم بۆ هاتووە چی لێ بکەم و چۆنی دابەش بکەم، حاجی مەحمودی گەلالی دەڵێ بەو سوێند وقورئانە بە چاوی خۆم دیومە ئەو کەمال عەلییە دوو لۆری ئازوقەی فرۆشتوە، بە کاک مولازم عومەر دەڵێ: وا جوابی دەوە ئەو دوو لۆرییەی چۆن فرۆشت ودزی، ئەوانی دیش ئەوها بفرۆشی و بدزی! نەبروسکە هاتبوو نە ئازووقەش هاتبوو!

## شیوعیەت زۆربـەی کـوڕە مـەلاکان لەگەڵی بووین

١١٢. سەردەمانێک زۆرینەی خەڵکی کۆیە ودەوروبـەری شیوعی بوون، دوایی کەوتە کزی و ئەوەی سەیرە، زۆربەی کوڕە مەلاکان شیوعی بـوون، لەسەرانسەری کوردستانیش بەردی بناغەی شیوعیەت وسەرکردە دیارەکانی حزبی شیوعی کوڕە مەلا ومەلا زادە بوون: بۆیە کە کەوتبوونە کزی وشکست شاعیرێکی کۆیی گوتوویەتی:

**لە ڕاستەوە بۆ چەپەی**
**مەلا قادری گۆپتەپەی**
**شوکر نەماوە حەپەی**

## فرێی دەدەمە کانی ژنان

١١٣.(ح.ق.د) تەمەنی ژن هێنانی بەسەرچوو بوو، بە درەنگ وەختی ئینجا ژنی هێنا، جا لە پێشمەرگایەتی کە بەو تەمەنەی ژنی نەهێنا بوو، دەچوو مالان دابەش دەبوو، لێیان دەپرسی ئەری ژنت هەر نەهێنا ئەویش بێ شەرمانە دەیگوت وەڵا بە تەمام کێر وگونم لەسەر تەختی قیمەی دابنێم وبە تەورداسێک لە بنەوە بیبرِمەوە فرێی دەمە ناو کانی ژنان با گەمەی پێبکەن، بۆ چیمە تازە!!

## کورسی تاسەر بۆ کەس نییە!!

١١٤. شێخ حەمە ساڵح برا گەورەی مام جەلال بوو، شێخ حەمە ساڵح لە گوندی کەلکان خەریکی جووتیاری و کاسبکاری بوو، پەیوەست بوو بە زەوییەکانی کەلکانەوە لە زەمانی باپیریانەوە بە لیرە کڕیبوویان، جا کێشەی هەبوو لەگەڵ جوتیاران ساڵی ١٩٨١ دەچنە کن مام جەلالی، مام جەلالیش پشتگیری نەکرد ولایەنی جوتیارەکانی گرت وقسەکانی شێخ حەمە ساڵحی نەسەلماند، ئیتر شێخ حەمە ساڵح تووڕە بوو ئەوسا مام جەلال و سەرکردایەتی لە (خرێ نێرزەنگ)بوون، بۆیە چووە بارەگای د.خدری بەرامبەر ماڵ وبارەگای مام جەلال: دەیگوت جەلال هەروا نایخۆی کورسی تاسەر بۆ کەس نییە!!

## زەرد و سەوز

١١٥. پارتی ڕەنگی زەردی لە مێژ بوو هەڵبژارد بوو پاش یەکەم هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ (ی.ن.ک) بە پێشنیازی د.فواد مەعسوم ڕەنگی کەسک (سەوز)ی هەڵبژارد، جا زەرد و سەوز بووە نیشانە وململانێ جارێک مام جەلال ومەسعود بارزانی پێکەوە دەبن، مام جەلال دەڵێ تەماشای ئەو دەشت و شاخ و مێرگ و گوڵزارە هەمووی سەوزە! بارزانیش دەڵێ سەرەنجام کە وشک بوون زەرد دەبن!!

## بەرازیل

١١٦. وەزیرێکی بەڕازیلی هاتبووە هەرێمی کوردستان بە مام جەلالی گوتبوو یەکەم جارمە هەرێمێک بناسم بە ناوی (کوردستان)مام جەلالیش پێی گوتبوو وەڵا ئێمەش وەکو کورد بەهۆی یاریزان (ڕۆنالدۆ)وە زانیومانە بەڕازیل وڵاتە وامان دەزانی بەڕازیل دەبابەیە، مانگایە!! بەس تۆپانێ دەزانن!.

## تاکە نەعل

١١٧. نوورە قەڵەو ناسراو بە (رەئیس) خەڵکی کەرکوک بوو پ.م وشۆفێری تیپی ٢١ ی کەرکوک بوون ساڵی ١٩٨٤ دوو هێلکە لە گۆپتەپە وەردەگرێ دەیباتە گوندی عەسکەر بۆی بکەن بە هێلکەوڕۆن، یەک لە برادەرەکانی بە کابانی ماڵ دەڵێ ئاردی

بۆ تێکە با زۆربێ و حەزی لێ یەتی پێی تێربێ، کە ئامادە دەبێ و لەبەر دەمی دادەنێن ئارد وهێلکە وا پەنماوە و وەک ئەسفنج و زۆر وئەستور، رەئیس دەڵێ ئەوە چییە کەی ئەمە هێلکەورۆنە؟ کابانی ماڵ دەڵێ لەسەر داوای خۆتان بوو، بۆیە رەئیس دەڵێ: تەرە پیاز ونێرکە پیازتان نییە؟ دەڵێن نەوەڵڵا بۆچیتە! رەئیس دەڵێ لەم سەر ولەوسەری دادەنێم دەیکەم بە تاکە نەعل!!

## مام جەلال چاومانی

١١٨. حاجی مامز تێکۆشەرێکی دڵسۆز وبە پەرۆشی (ی.ن.ک) لە کۆبوونەوەی مەڵبەندەکان لە شاری هەولێر مام جەلال کۆبونەوەیان پێ دەکا، حاجی مامز لەو کۆبوونەوەیە داوا لە مام جەلال دەکات ودەڵێت چاوم کز بووە، باش نابینم ئەو هەموو خزمەت وخەباتەم هەیە، چاوم بێکەڵک بووە چاکی بکەنەوە رۆحم. مام جەلالیش مایکرۆفۆنەکەی لەبەردەمە گوایە بە نهێنی وبەدزی بە کۆسرەت رەسوڵ دەڵێ بیبەینە ئێران وچاکی بکەنەوە، حاجی مامز وهەموو لەوێ گوێیان لێ دەبێ، حاجی مامز هاوار دەکات مام جەلال چاومانی، مام جەلال چاومانی، مام جەلالیش دەڵێ چاوت بە کەڵک نایەت جێیەکی دیکە بڵێ! بەکەڵک بێت!

## حکومەت بۆ خۆی تێ دەگات!

١١٩. بشیر مشیریان ئوستاد کەسایەتییەکی سەیر بوو خۆی بە گەورەی کورد دادەنا وخەیاڵی لێدەبووە ڕاستی، لە حەیدەر خانەی بەغدا قەڵغان بوو بۆ سیاسەتمەداران ورەوشەنبیرانی ئەو سەردەمە! دوکانەکەی یانەیەکی سیاسی بوو، لە دوکانەکەی نوسیبووی ( الخیاط الملکي و العسکري) صاحب المقص الذهبي (البشیر المشیر) بشیر مشیر لە ساڵی ١٨٩٠ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە، چۆتە بەغدا بەرگ درووبی کردووە، دەڵێن (زەفتێ) بووە کتێب و ڕۆژنامە وگۆڤاری فرۆشتووە، لە ١٩٦٣/٧/٣٠ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، زۆربەی ژیانی لە بەغدا ولەناو عەرەبان بووە، کەچی وەسیەتی کرد بوو لە سلێمانی بمنێژن چونکە لە پاش مردن لە ناو عارەبان ناحەوێمەوە!! ئوستاد وتار ونوسین وشیعری نەبووە، بەڵام ئیمزای کردووە، بۆتە مولکێ ئەو، هەندێ زاراوەی هەبوو هەروەک. (ئەمین –من) –(پەیتووکە –ماشێن – سیارە) (دیماغ – دەماغ) –(جەعلی – دەستکرد) جەوابمان دا – دەرمان کرد – پوختە ئەفسوونێک بوو لە کەسایەتی خۆیدا، خۆی بە فەیلەسووف دەزانی، بەشیریستەکان و موژدەی حەوتەوانە، مەسەلەی خۆش و خەمرەوێن و دووربینی لێ دەگێڕنەوە، جارێک مام جەلال وتارێکی بە عەرەبی بەناوی بشیر مشیر نوسیبوو، دەربارەی هەندێ ڕوون کردنەوەی وەزیری دەرەوەی ئێران، تێدا نووسرا بوو ئەسڵی کورد فارسە!! مام جەلال نووسیبووی

دیراساتی فیلولۆجی ولیکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆجی ڕوونـی کردۆتەوە کەوا ئەسڵی فارس کوردە!! بۆیە هەقە فارسەکان قسەی وانەکەن! وتارەکە هێندە کاریگەر وگرینگ بوو دەنگی دا بۆوە حاجی مەلا سەعید دەچێتە دوکانەکەی ودەڵێ مامۆستا وتارەکەتم خوێندەوە، وتارێکی زۆر جوان بوو، بشیر مشیر دەڵێ(ئەمین) واتە (من) شتی جوان دەنوسم، کابرا دەپرسێت دوو وشەی تێدا بوو (فیلۆجی وئەنترۆپۆلۆجی) تێیان نەگەیشتم مامۆستا بشیر مشیر خۆی نەیدەزانی مانای چی یە ودەڵێ (ئەوە حکومەت بۆ خۆی تێی دەگات)، کابرا دەڵێ ئاخر مامۆستا من لە ڕۆژنامە کاردەکەم وقوتابی کولیەم نابێ یەکێکی وەک من تێی نەگات! سەرەنجام ئوستاد بشیر مشیر تووڕە دەبێت ودەڵێت (ئەمین جەلەبی نانووسم تا ئەتۆ تێ بگەیت)! حکومەت بۆخۆی تێی دەگات وبڕایەوە!

## چوار پێ

١٢٠. لە پاش واژۆکردنی ڕیفۆرم، لەناو (ی.ن.ک) ئاڕاستەیەک پەیدابوو گرووپێک بە ناوی پەیڕەوانی پەیڕەو وپڕۆگرام، ئاسۆ شێخ نوری بە نوێنەرایەتیی ئەو گرووپە دەچێتە کن مام جەلال باس دەکات مام جەلالیش دەڵێ: پەیڕەوانی پەیڕەو و پڕۆگرام سێ پێیە پێیەکی دیکەی لەگەڵ با دەبوونە چوار پێ!!

## (م.س.ژ)

١٢١. (م.س.ژ) زۆر دەم پیس و جنێوی بە هەموو کەس دەدا، لێپرسراوی ئیدارە بوو لە م.س (ی.ن.ک ) لە قاسمە رەش جارێک کەس نەما بوو جنێوی پێ بدا لە پڕ گوتی: (( لە قوزی دایکی خۆم بەم ))

## بۆ وا ڕەشە ؟!

١٢٢. میران خدر حەمە ئاودێر لە بانەوە هاتوونەتە شەوگێری دەشتی کۆیە، ئاودێری زانیوە ساڵی ١٩٨٢ ناویان ناوە ئاودێر، لە شۆڕشی ئەیلول پارچەیەک تۆپی بەر دەکەوێت بن ڕانی بریندار دەبێت، لە هێرشێکی دوژمنانەی حکومەتی عێراق، گوندی شەوگێر دەسوتێنن! و کوژراو وبریندار لێ کەوتبۆوە! د.خالید سەعید بارەگای لە گوندی شیوەشان بوو، جگە لە کاروباری سیاسی وعەسکەری کاری پزیشکیشی دەکرد، جا برینەکە تیمار دەکات و خەریکی چارەسەری بوو لێی پرسیبوو مام میران گونت بۆ وا ڕەشە؟! مام میرانیش گووتبووی: تۆپم زۆر پێ هاویشتووە!!

## پۆڕی خوراو

١٢٣. هەڵۆی سوور لە بەغدا هێزێکی (ڤەشارتی) بوون ساڵی ١٩٧٧ سەر بە (ی.ن.ک) بوون بۆ تەمبێ کردنی سەرانی بەعس و گورزەوەشاندن، سەلام عەبدولرەزاق دەیگوت ناوەکەی هێند بە

سامە، خەڵک دەترسێ دەبوو ناومان (مامر قرمزی) و (جووجە قرمزی) بوایە چالاکییەکیان کرد (عوسمان محمد فایەق) یان کوشت، سەرەنجام گیران، مولازم جوامێر سیامیر سەرپەرشتی دەکردن و م.جەعفەر خانەقینی (فازیل کەریم) ناوی لێنابوون هەڵۆی سوور هەموویان شەهید کران. دەیانگوت هەڵۆی سوور بوون بە پۆڕی خوراو.

## خوراندن

١٢٤. لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانیدا لە مام جەلال دەپرسن بۆ لەبن عەینەکەوە چاوت دەخورێنی بۆ عەینەکەکە داناکەنی مام جەلالیش دەڵێ کامێرا وتۆمارگا بکوژێنەوە ئەوجا بە کابرای ڕۆژنامەوان دەڵێ: گەر قینگت بخورێ، پانتۆڵەکەت دادەکەنی قینگت بخورێنی!!

## شەڕواڵ گۆڕینەوە

١٢٥. مەلاییەکان هەمیشە بە باڵی م.س و جەلالییەکانیان دەگوت ئەمانە یەکتر دەگێن، جارێک (ن.ک) و (م.ع) لە ساڵی ١٩٨١ لە (خڕێ نێر زەنگ) قاتی پێشمەرگانە و شەڕواڵ دەگۆڕنەوە لەو کاتە پێشمەرگەیەک دەرگا دەکاتەوە ئەو کارەی گۆڕینەوەی شەڕواڵ دەبینێ داوای لێبووردن دەکات، (م.ع)یش بەپەلە بانگی دەکات و پێی دەڵێ بە ڕاستی شەڕواڵمان گۆڕیەوە نەبادا وا

تیبگەی کاری خراپمان لەگەڵ یەکتر کردووە، چونکە هەمیشە مەلا مستەفا وای بە جەماعەتی جەلالییەکانی دەگوت ئەمانە یەکتر دەگێن!

## عەموودی کارەبا

١٢٦. مام جەلال لە ساڵی ١٩٦٣ لە کۆیە بوو، د.خدریش مالیان لە کۆیە بوو، بە ڕێکەوت مام جەلال بەکن ماڵی مەلا مەعسومدا تێپەڕ دەبێت، خەڵکی زۆر لەدەوروبەر بوو، د.خدر نەیتوانیبوو ببینێ! چوو بوو بە عەموودی کارەبا هەڵگەڕا بوو تاوەکو مام جەلال ببینێ، جا لە کۆبوونەوەی م.س(ی.ن.ک) ئەو مەسەلەیە دەگێڕێتەوە ئەو دەم د.خدر بەشداری کۆبوونەوەی (م.س)ی دەکرد، مام جەلال دەڵێ ئەوها بوو ئێستەش لە کۆبوونەوە دەمە دەمم لەگەڵ دەکەیت!! قسەم لە قسەدا دەکەیت.

## هاوڕێ لینین

١٢٧. هاورێیەکی حزبی شیوعی ئێراقی ساڵی ١٩٧١ دەیویست شیعرێک لەسەر هاوڕێ لینین بخوێنێتەوە، بەرامبەر مەلا نەفتە، کەسایەتییەکی دیارو بە دەسەلات بوو لە ناو حزب، مەلا نەفتە گوتی گەر شیعرەکەت باش بێ لە رۆژنامەی (بیری نوێ) بڵاویدەکەینەوە، هاوڕێ شاعیرەکە بەو شێوەیە شیعرەکەی دەخوێندەوە:

**هاوڕێ لینینه هاوڕێ لینینه**
**کەواو سەڵتەکــەی شینــــە**
**ئاگاداری بێ مەکە ومەدینە**

## عەسابە و ئەسحابە

١٢٨. پێشمەرگە پارتیزانەکان هەر دەیانگووت ئێمە حەربی عەسابات دەکەین زۆر جار تووشی ئەوە دەبوون کە (عەسابە) بە (ئەسحابە) تێ بگەن بۆیە پێیان دەگوتن حەدتان نییە کافرینە شەڕی ئەسحابان بکەن.

## (هەموو کوردت هێناوە)

١٢٩. حاجی فازیلی هونەرمەند ژەنیاری تەپڵ (تەپڵژەن)بوو لە تیپی باواجیی کۆیە، برادەرێکی کوردی ڕۆژهەلاتی ببووە دۆست وناسیاو هەر جارێکی دەهاتە کۆیە دەیگوت بفەرموو بۆ ئەو دیو سەردەشت وەک بە هەشتە، دەیگووت (سەردەشت واتە بەهەشت). بۆ لە کۆڕەوە ملیۆنییەکەی کورد ساڵی ١٩٩١ حاجی فازیل بەلێ قەوماوی گەیشتە سەر سنوور وسەردەشت، خەڵک تا بلێی بێ حاڵ بوون لەبن خێمە وبە پێ خواستی وزۆر کەس مردن لە سەرمان ولە ڕێگا، کەوتبوونە سەر جادان و لێیان قەوما بوو، حاجی فازیلیش بە دۆستەکەی دەڵێ: ئەوە بە هەشتەکە بوو، کابرای ناسیاویش گوتبوی جا من وام گووت بەو حاڵە بێن بە تەنیا بێن تۆ هەموو کوردت لەگەڵ خۆت هێناوە!!

## ئەدی ئەو قاچە

١٣٠. سالار بۆگدی فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٢١ ی کەرکوک، ساڵی ١٩٨٢، دەچێتە کن مام جەلال داوای لێدەکات ئەوەندە بریندارانەمان هەیە بە گوێرەی ناو نووسکردنی بریندارەکان مام جەلال بۆ هەر بریندارەی دەمانچەکی بە دیاری دەداتێ سالار بۆگدی دەمانچەکان بە ناو دەداتە بریندارەکان، دەچێتە کن سیروانی کوێخا نەجم بریندار بووە برینەکەشی وا بوو لە قاچ کەوتبوو، بەر قاچی کەوتبوو سیروان بە سالار دەڵێ کوا دەمانچەکەم! سالار بۆگدی دەڵێ وەڵاهی نەمزانی بریندار بووی ناوی تۆم لە بیرچووە ببوورە، دەمانچەکانم لەسەر ناو هێناوە، تۆی تێدا نییە، سیروانیش دەڵێ: بۆ بریندار نیم، منتان بیر چووە دەست لەسەر قاچە بریندارەکە دادەنێ وپە سالار دەڵێ:

ئەدی ئەو قاچە بە قوزی دایکی کێ؟

## منارە

١٣١. لە کۆیە دوو بنەماڵە هەیە غەفووری وحەوێزی هەمیشە لە ناکۆکی و ململانێدا بووین حەوێزییەکان مزگەوتی گەورەو قەیسەرییان دروست کردووە، غەفووریەکانیش حەمام وخانی کەران، هەر چەند تێکەڵاون وژنیان لە یەکتر خواستووە، بەڵام ململانێیان هەر هەیە! لە ساڵی ١٩٨٠ یەکان حەوێزییەکان منارەی مزگەوتی گەورەیان چاکدەکردەوە، غەفورییەکانیش دوو

فەوجی خەفیفەیان دروست کرد(قاسماغا وزاهیراغا) نەژادی عەبدولرەحمانە شێتە لە حەوێزییەکانە دەیگوت غەفورییەکان با هەر فەوجی جاش دروست بکەن و جاش زیاتر بکەن ئێمەش کێری خوا ئەستوورتر دەکەین (مەبەستی منارەی مزگەوتی گەورەی حەوێزییان) بوو.

## عەلی شامار

١٣٢. یەک لە هەڵگیرسێنەرانی شۆڕشی نوێیە لە سەرەتای شۆرشی ئەیلوولەوە بۆتە پێشمەرگە، سەردەمێک لێپرسراوی زیندان بوو لە گوندی (شینێ)، زیندانییەک سکاڵا دەکات گوایە عەلی شامار بە(خاکەناز) لێی دراوە، تومەز زللەی لێدابوو دەست وناولەپی بەقەد خاکەنازێک بووە، دوایی چۆتە گەرمیان فەرماندەی کەرت بووە، تورکمانیک دەیەوێ ببێ بە پێشمەرگە لایان گوتبووی هاتووم ببمە موخەریب لە تەک جەماعەت عەلی شامار پێیان گوتبوو چۆن سیقەت پێبکەین؟ کێ دەڵێ جاسووسنی دەبێ کەفیلت هەبێ تورکمانەکە گوتبووی (عەمۆی جیرانمان کوردە ماڵیان لە جەوەڵەکە لە قەریەیە باعەیان هەیە).

## مەلیک فەیسەڵ

١٣٣. جەوهەر غەمگین، یەکەم کەس بووە لە هەولێر شیعری پەنجەیی بەکار هێناوە، تاکە شاعیرێکی هەولێری بووە لەسەر

شیعر نۆ مانگ حوکم دراوە لە ساڵی ١٩٥٥، لەسەر ئەو کۆپلە شیعرەی سەر مەلیک فەیسەڵ حوکم دراوە:

**گوێ بگرە فەیسەڵ**
**ئەی دوژمنی گــەل**
**ڕاوچی بێ ئایـــن**
**خوێنمژی گشت مەل**

## مقەڵیەکەتان نوقسانە

١٣٤. ساڵی ١٩٨٦ لە یاخسەمەر کۆبوونەوە هەبوو، نەوشیروان مستەفا دێتە دەرەوە، بەڕێکەوت چاوی بە ئازادی عوسمان کەوەر وخولە جگەر و بەرزانی قالە خەڵووز، دەکەوێ، کە ئەو سێ کەسە دەبینێ، بە پێکەنینەوە پێیان دەڵێ بە خوا بەس مقەڵیەکەتان نوقسانە!!

## جاشێکی تڕکەن

١٣٥. ئەحمەد کوردە فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر بۆسەیەکی پێشمەرگانە لە نزیک گوندی (گۆمەتاڵ) دادەنێن نزیک دێگەڵە، لە نێوان ڕێگای سەرەکی کۆیە و هەولێر بە مەبەستی پشکنین ودەستگیرکردنی خۆفرۆش وبەعسی وجاش، ئۆتۆمبێل ڕادەگرن ویەک لە سەرنشینەکان داوای ناسنامەی لێدەکەن گومانی لێدەکەن جاش بێ وخۆفرۆش

بێ گوتبووی ناسنامەم پێ نییە جاش نیم دای دەبەزێنن زۆری لێدەکۆڵنەوە نکۆڵی لێدەکات سەرەنجام ئەحمەد کوردە یەک زللەی وای لێدەدات کابرا بایەکی دەنگداری لێبەر دەبێ دەڵێ جاش وەرەقەم، وەرەقەی جاشایەتی نیشان دەدا ئەحمەد کوردە دەڵێ برۆ ئازاد بە مادام جاشێکی هێندە ترسنۆک و خوێری بەیەک زللە تڕێکت کەند هیچ نی بڕۆ بەڕەڵلابە!! وا بڵاوبۆوە جاش تڕکەن بەر دەدەن سزای نادەن.

## ناشیرینترین کەسی بۆیە ناسیتی

١٣٦. ساڵی ١٩٨٥ نەوشیڕوان مستەفا گەشتێکی کرد بە دەشتی کۆیە و دۆڵی خۆشناوەتیدا و تا وەرتێ و فەقێ یان، مام ڕۆستەمی لە گەڵدا بوو، بە ڕێکەوت چوونە بن ڕەشماڵێک کابرای خاوەن ماڵ بانگی مام ڕۆستەم دەکاتن ودەڵێ مادام کاک نەوشێروانە دوو حەیوانان سەر دەبرم، نەوشێروان ئاگای لە مام رۆستەم و کابرای خاوەن ماڵ دەبێ، دەڵێ رۆستەم ئەوە چ بوو، با کابرا خەسارەت نەدا، نامانناسن و من ناناسن مام رۆستەمیش دەڵێ وەڵلا کابرا ناسیتی گوتی دوو حەیوانان سەردەبرم نەوشێروان بۆ پێت گوت ئەوە نەوشیروانە، مام ڕۆستەم دەڵێ پێم نەگوتووە کابرا ناسیتی، نەوشێروان چۆن ناسیمی تۆ پێت گوتووە مام رۆستەم دەڵێ خۆی تۆی ناسی چونکە ناشیرینی وەک تۆ لە ئۆمەتی پێغەمبەری نییە، کابرا

بەوەی زانی و ناسیتی ئەگینا من پێم نەگوتووە لە بەر ئەوە کاک نەوشیروان!! لە گۆی زەوی لە تۆ ناشیرنتر نییە.

## کیر و گونم ببەستنەوە!

١٣٧. بەکر حەویز ئەحمەدی مام برایمی ناسراو بە (بەکر بێ قۆر) لە کاتی دروێنە داسی لە باسکی خۆی دابوو قۆڵی یان بڕیبۆوە بۆیە ناویان نابوو (بەکر بێ قۆر) بێ قوڵ خەڵکی کۆیە بوو لە عەشقی پێشمەرگایەتی ساڵی ١٩٧٧ یارمەتی پێشمەرگەکانی (ی.ن.ک) دەدات لە گوندی (بۆگد) دەرمان وخواردنیان بۆ دەبات وحەرەسیاتیان بۆ دەگرێ و وێنەی یادگارییان لەگەڵ دەگرێ، لەسەر ئەو هاوکاری و پەرۆشییە، دەناسرێ ودەگیرێ حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەردەچێ، لە ١٩٧٧/١/١٧ ئۆسۆ نوری و جەلال خۆشناو کۆیین لە بەندیخانەی موسڵ چاویان پێدەکەوێ هێند ورە بەرز وبێ منەت بووە، گوتبووی دەبێ جەللادەکانی بەعس کەلەپچە لە کێر و گونم بخەن چونکە قۆڵێکم نیە تا کەلەپچەم بکەن بۆیە بە پێکەنینەوە دەیگوت دەبێ کێر و گونم ببەستنەوە لە ١٩٧٨/١/٣١ لە تەمەنی بیست ساڵی لە موسڵ لە سێدارە درا.

## توخوا گووەکی دیکە ناخۆی

١٣٨. لەزستانی ساڵی ١٩٨٢ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەکانی هەرێمی سێی شارباژێر لەناو بەفرو هەورازی ڕک وسەختدا بە

هەورازی (ئەسپە نێزەدا) ماندوو شەکەت بوو بوون، پێشمەرگەیەک دەڵێ خۆزگە هەلی کۆپتەرێک پەیدادەبوو هەمووومانی بار دەکرد بۆ بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتی (ی.ن.ک) لەخڕێ نێرزەنگ و زەڵێ و توژەڵەو شێنێ، لەپڕ هەلی کۆپتەرێک پەیدا بوو، هەموو خۆیان، لەناو بەفر وکەلێنی شاخ شـاردەوە، وەخت بوو رەق ببنەوە،هەلیکۆپتەرەکە هەر لەسەر سەریان دەسووڕایەوە، گرەی دەهات وسێبەری دەکرد وناڕەحەتی کردبوون، کە هەلیکۆپتەرەکە ڕۆیی یەک لە پێشمەرگەکان بە پێشمەرگە خۆزگە خوازەکە دەڵێ: توخوا گەر گووەکی دیکە نەخۆی بەو دەمە ڕەشەت دەڵێی جیهازتان بۆ کردووە! هەلیکۆپتەر بێتە سەرسەرمان وەخت بوو هەموومان بکوژێ!.

## (گوێ گرتن لەمشک)

١٣٩. ساڵی ١٩٨٥پێشمەرگەکانی تیپی٤٧ی پیرەمەگروون لە گوندی قزلەرەوە دەیانەوێ بچنە (چوخماخ) بە تراکتۆر سوار بوو بوون هونەرمەند حەمەجەزا وشێخ عومەری ئیدارە و وەستا فەرمانیان لەگەڵ بوو لەڕێگا گەنجێک تووشیان دەبێ! کتێبێکی پێیە سواری تراکتۆری دەکەن، وەستا فەرمان لێ دەپرسێت ئەو کتێبە چییە کابرای گەنجی خاوەن کتێب ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و عەیار (٢٤)بوو دەڵێ ئەوکتێبە کتێبی مارکسییە، وەستا فەرمان دەڵێ حەزم لێی نییە! کابرای ڕێکخستن

دەڵێت چیت حەز لێ نییە خۆ برنج وفاسۆلیا نییە هەرکەسێ بیخوێنێتەوە، واتە مارکسیەتی هەزم کردووە، شێخ عومەری ئیدارە تەماشای کتێبەکە دەکا، سوچێکی کتێبەکە لێ کراوەتەوە وقرتاوە لێ دەپرسێت ئەوە بۆ دڕاو وقرتاوە کابرای ڕێکخستنی شار دەڵێت وەڵڵا ئەوە مشک خواردویەتی وەستا فەرمان دەڵێ ئەو مشکە لەکوێیە؟ گوێی لێ بگرین مادام مارکسیەتی هەزم کردووە کابرای ڕێکخستنی شار ومارکسی توورە دەبێت دەڵێ من لە شارەوە هاتووم خۆم کوشتووە هاتوومەتە قڕگە بە نۆ ڕۆژ گەیشتوومەتە لای ئێوە! دەمەوێ خۆم بەکوشت بدەم لەسەر ڕێبازی مارکسیەت ئێوەش پێم ڕادەبوێرن بەوقسانە نابەزم کۆڵ نادەم تا بەئامانج نەگەم، شێخ عومەری ئیدارە دەڵێ قوربان با تۆزێ (ئەسپێ) بچێتە ناو گیانتەوە دە پانزە جیم ساوار عافێت بکەیت، کتێبەکەت لەبیر دەچێتەوە باقی کتێبەکەت مشکی تر دەیخوات!!

## فێرە یاسای سەربازی بە!

١٤٠. ژنێک خۆی ئەفسەر بوو لەفەوجی ژنان، مێردەکەشی نائب زابت بوو، ژنەکە هەر دەیگوت دەبێ یاسای سەربازی فێربی ڕێزی نجمە لەخۆت گەورەتر بگریت ئەوە سەربازییە، شەوێک پیاوەکە دەچێتە کن ژنەکەی تەحیەکی بۆ دەکات، دەڵێ گەورەم گانێکی بکەین؟ ژنەکەش دەڵێ باشە ئەوها فێری قانونی سەربازی بە!.

## با من بم

١٤١. سالی١٩٨٦ پێشمەرگەکانی مەکتەبی عەسکەری جەولەیان دەکرد لە دۆڵی جافایەتی، شێخ عومەری ئیدارە وموژدە شێت بەو زستانە بەر ماڵێک کەوتن منداڵەکە سۆپەی بۆ جۆش دەدان وداری دەهاویشتە ناو سۆپاکەوە، موژدە شێت گوتی ئێستا ئەو منداڵە هەشت نۆ ساڵە توورە دەکەم موژدە شێت دوو تری کەند شرقەی هات، بە منداڵەکەی گوت گوێی مەدەرێ منداڵەکە گوتی من نەبووم هەڵساو دایکی بانگ کرد، موژدە شێت لەکن دایکی پێی گوت هەی ترکەن، منداڵەکە گوتی بەخودا درۆ دەکات من نەبووم، موژدەش قاقا پێدەکەنێ وپاڵی دابۆوە بەکەماڵی ئیسراحەت دەیگوت قەیناکە با من بم بە منداڵی هەموو ترمان کەندووە، چی تیایە، منداڵەکەش دەیگوت بەخوا دایە ئەو بوو ئەو ڕەشە دووجار تری کەند!!

## نەبادا شتێکی گرنگ بێ

١٤٢. مەفرەزەیەکی پێشمەرگەکانی هەرێمی یەک لەساڵی ١٩٧٧ لەماڵێک دەبن لە شارەزوور، لەپڕ سوپای سەرباز وجاش دێن چواردەوری دێیەکە دەگرن کابرای خاوەن ماڵ پێشمەرگەکان لە گەوڕەکە دەشارێتەوە، دەڵێ تەقە مەکەن، بێ دەنگ بن، سوپا وسەرباز وجاش دێن دەگەڕێن، بێ تەقە وشەڕ دەڕۆنەوە! یەک لەو پێشمەرگانە تەنگاو دەبێ، دەچێتە سەرئاو، پیساییەکەی

لەناو عەلاگەیەکی ڕەش دەکات، دەیپێچێتەوە لەوێ دایدەنێ، ئیتر پاش ئارام بوونەوە وئاسایی بوونەوە پێشمەرگەکان دەزانن ئەو گوندە بەجێ دەهێڵن کابرای خاوەن ماڵ دەچێتە گەوڕەکە نەبادا شتێکیان لێ بەجێ مابێ، چونکە فیشەک وتفەنگ ومەخزەنی گوللە بەجێ مابا، بدۆزرابایەوە کابرای خاوەن ماڵ لە سێدارە دەدرا، کابرا ئەو عەلاگەیە دەبینێ، بەدزی لەبن هەنگڵی دادەنێ وبەدوایان دەکەوێت وپێش ئەوەی بگەنە گوندێکی دیکە دەیانگاتێ وتووشیان دەبێ ودەڵێ ئەو عەلاگەتان لێ بەجێ ماوە، لەبیرتان چووە، نەبادا شتێکی گرنگ بێ، پێشمەرگەکەش دەزانێ چی کردووە، دەڵێ ئەوە تازە بزانم، پێشمەرگە گووەکەشی قاچاخە!!.

## گیرم خواردووە

١٤٣. لەساڵی١٩٨٦ لە گوندێکی دۆڵی جافایەتی شێخ عومەری ئیدارە هاتوچۆی ماڵێکی دەکرد ودۆست وجێی باوەڕبوون، هاتوچۆی شاریشیان دەکرد سەردانی کەسوکاری شێخ عومەری ئیدارەیان دەکرد، نامەو خواردن وشتی پێویستیان بۆ دەهێنان ودەبرد، ڕۆژێکی کابرای خاوەن ماڵ لەمزگەوت کردی بەهەرا لەگەڵ خزمەکەی خۆی زۆر تووڕە بوو، پێی گوت ماڵات ومانگا وگوێ درێژی تۆ چوونەتە ناو زراعەتەکەم زەرەریان داوە، کابرا گوتی بەچی دەزانی، گوتی دەڕاوەستە دەسەسرێکی دەرهێنا تەرسی تێدابوو گوتی ئەوەتا ئەوە هی باوکمە کابرا گوتی بڕوا

ناکەم ئەوە تەپاڵەی مانگا زەرد و پشقلی مەڕ وبزنانی من بێ، کابرای توورە گووتی باشە ئەوەشت بۆ دەهێنم دەیخەمە سەر سفرەی نان خواردنت هەموو تەماتە وباخی منی تێک داوە ئەوجا حاشای لێ دەکەیت! کابرای خەتابار گوتی ئەی بۆ من قسە ناکەم ساڵ دوانزە مانگ رەحەت دەبی لە خەجێی خزمم، تف وبەڵغەم ڕۆدەکەی قسە ناکەم، کابرای توورە گوتی وەڵلا وەڵلا گیرم خواردووە بەدەست خەجێی خزمتانەوە ئەو ڕەحەت دەبێ ومن ٥ ساڵە ڕەحەت نەبوویم هەتا من کوتێ دەوەشێنم، ئەو قەبری باوکم دەهێنێتەدەر، هەموو دەم زەوقی هەیە دووجار گیرم خواردووە یەک ژنەکەم کە خزمتانە دوو لەبەر مەڕ ماڵات وگوێدرێژەکەتان! ئیتر لەبەردەرکی مزگەوت لەکن ئەو هەموو حەشامات وپێشمەرگەیە دەست دەکەن بە پێکەنین!!.

## تەڕبوون

١٤٤. لەمزگەوتی گەورەی سلێمانی شێخ عومەری ئیدارە وکامیلی خزمی دەست بە ئاو دەگەیەنن! لەپڕ یەک مەسینەی ئاو بە شێخ عومەردا دەکەن، تەڕ دەبێ، شێخ عومەریش مەسینەکە پڕ دەکات، بەتەنیشت خۆی وادەکا وادەزانێ کامیلی خزمیەتی تومەز ئینزباتی عەسکەریە هاواردەکا خاتر ئەڵلا خاتر محەمەد شێخ عومەر دەڵێ هەتیو خوێڕی بۆ بەعەرەبی قسە دەکەی کە خۆی بەرز دەکاتەوە دەبینێ ئینزیباتی عەسکەریە، شێخ عومەر

دەتۆقی یەکسەر ڕادەکا، ئینزباتەحەش تەقەی لێ دەکات کاملیش پێی پێ دەکەنێ!!.

## لە ئێستاوە

١٤٥ شێخ عومەری ئیدارە خۆی لەقەرەی شیعر دەدا جارجارە ئەمەی وتووە:

**هەرچی هەورازە دێنە سەر ڕێکـــــــەم**
**قەت ماندوو نابم کاڵتەی پێ ئەکـــــــەم**
**هەمووکەوتنێک لە هەورازدایــــــــــە**
**سەرکەوتن خۆشە کە دێتە کایــــــــە**
**هەرکات ژێر کەوتی قەت کۆڵ نەدەی لێی**
**هەر ژێرکەوتنە دەرس وەرئەگری لێـــی**

شێخ عومەری ئیدارە جارێک لە جەولەی پێشمەرگایەتی دەیانەوێ بپەڕنەوە، یەخەی پێشمەرگەیەک دەگرێ کە شارەزابوو بیانپەڕێنێتەوە، یەک خووی خراپ لەناو پێشمەرگە هەبوو هەرکەسێ پێش دەکەوت وچاوساغ بوایە وەک شارەزا لەپشتەوە کە پێشمەرگە ماندوو دەبوون چەندان جنێوی ناشرینیان دەدا وتووڕە دەبوون، خۆیان لە چاوساغی شارەزا تووڕە دەکرد، ئەو پێشمەرگەیەش دەیزانی زۆری لێ دەکەن دەڵێت باشە پێش دەکەوم وشارەزام دەتانپەڕێنمەوە بەس لە ئێستاوە لە قوزی خوشک ودایکتان بەم چونکە دەزانم لە پشتەوە جنێوم پێ دەدەن!!.

## صه

١٤٦. لەناوچەی هەولێر بە سەگ دەڵێن (صه) ئیتر پێشمەرگەیەکی هەولێری تیپی ٨٧ی قەرەچووغ دەچێتە ئیدارەی (ی.ن.ک) کاغەزێکی پێ دەبێ شتێکی بۆ خەرج بکەن دەگاتە پرسگە دەڵێ ئیشم بە مەسئولەکەتە دەچمە کنی، کابرای پرسگەش خەڵکی سلێمانی بوو بێ مەبەست دەڵێت (کاکە صەی وەک تۆ چاوەڕێن) کابرای هەولێری تووڕە دەبێ ودەڵێ بەکێ دەڵێ صه دەیکات بەشەڕ، دوای تێیان گەیاند مەبەستی ئەوەیە کە سەد کەسی دیکە لەپێش تۆوەن چاوەڕێ دەکەن! تومەز صه بەسەگ تێ گەیشتبوو نەک سەد!!.

## نەچی پارەی پێ نەماوە

١٤٧. هەرچەند سەری ساڵ وبۆنە وجەژن لەکن پێشمەرگە وەک ڕۆژی دیکە ئاسایی بوون بەڵام لەسەری ساڵی ١٩٨٦ لەسەرگەڵوو بارەگای مەڵبەندی دووی لێ بوو، لە ژووری جیهاز لەکن کاروانی جیهاز وحاجی ڕزگارە قەڵەو وعەتای حاجی عەلی وبەرزانە ڕەش و شێخ عومەری ئیدارە وئەنوەری حەلاو، هەندێک قاپە ئارەق پەیدا دەکەن بۆ خواردنەوە، مولازم عومەر لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو لەماڵی قادری حاجی عەلی بوو، پێی ڕاگەیاندبوون شەڕ وگێچەڵ نەکەن وئاژاوە نەنێنەوە، پۆرت نەشکێنن، ئەنوەری حەلاو بەسەرخۆشی پۆرتی دەشکێنێ

ودەیکاتە شەڕ، مولازم عومەر دەزانێتەوە، لێی توورە دەبێت ودوو زللەی پێدا دەکێشێ، دەڵێ بڕۆ، تۆزێک دەڕوا، مولازم عومەر بەزەیی پێدادێتەوە دوو بیست وپێنجی دەداتێ، دیسان لێی توورە دەبێتەوە، ئەنوەری حەلاو دەڵێ ناکرێ دوو شەقم تێ هەڵبدەی، دوو بیست وپێنجی دیکەم بدەیتێ، مولازم عومەر دەڵێ پارەم پێ نەماوە هەر ئەوەندە بوو! پێشمەرگەکان دەزانن، یەک لە پێشمەرگەکان دەیەوێ فیتنەیەک دروست بکات بەڵکو پارە وەربگرێ وەک ئەنوەری حەلاو، بەڵام ئەنوەری حەلاو پێی دەڵێ سەهووی پارەی پێ نەماوە مولازم عومەر، دەنا بۆخۆم دەچووم و دووشەقی تێ هەڵبدابام ودوو بیست وپێنجی ترم لێ وەرگرتبا!.

## یەکبگرن

١٤٨. لە ساڵی ١٩٨٤ کومەڵێک کادیری پێشکەوتوو وفەرماندە لابرابوون وسڕکرابوون لەوانە شێخ جەعفەر ومام ڕۆستەم وفاروق عەلی مەولوود لیوا سمکۆ دزەیی، فاروق عەلی مەولوود قسە خۆش بوو هەموو لە بالیسانی دۆڵی خۆشناوەتی بوون لە کونجێک بوون ناویان لێنابوو ترۆخانە یان قەلەندەرخانە هەمووی لابرابوون وبێکار مابوونەوە، فاروق عەلی مەولوود دەیگوت: لەجیاتی ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن دەیگووت ترۆکراوانی یەکێتی یەکبگرن!!

## غەواسە!

١٤٩. ساڵی ١٩٨١ لە گوندی قاجری نزیک سەیدسادق پێشمەرگەکانی هەرێمی یەک وهەرێمی سێ وهەرێمی پێنجی قەرەداغ شەڕێکی قارەمانانە دەکەن! لەو شەڕەدا کاوە حەمە ساڵحی هونەرمەند بریندار دەبێ، دەبێتەکەم ئەندام! لەوکاتەدا هەلیکۆپتەر بەسەریان دەسووڕایەوە سێبەری دەکرد پێشمەرگەیەک بەناوی (ئازاد) ئاشکرا دەبێ، پێشمەرگەکەش دوو قامیشی بۆش دەگرێ خۆی دەخاتە ناو ئاوێ، بۆ ئەوەی هەناسەی پێ بدا، هەلیکۆپتەر نەیدەزانی ئەو پێشمەرگە چی لێهات زەوی قووتی دا، وەک غەواسە بوو بەو شێوەیە قووتاربووا!. پێشمەرگە بناسە، وەک غەواسە، لەبن ئاو دەدا هەناسە!

## ڕەفە شەل

١٥٠. ڕەفیق عەبدول ڕەحمان شەریف ناسراو بە (ڕەفە شەل) بەزمی زۆرە پ.م بوو لەتیپی ٩٠ی باواجی وتیپی ٩٣ی کۆیە کەم ئەندام بوو، پاش ڕاپەڕین دەگاتە یۆنان لەگەڵ کابرایەک بەشەڕدێت، ڕەفە شەلیش بە کەتەران هەموو لەشی بریندار دەکات، کابرای بریندار بە سەدان تەقەڵی لێ درا لە خەستەخانە جا لەگەڵ ڕەفە شەل پێک هاتن وسوڵحیان کرد، کابرای بریندار دەیگوت بۆخۆم لە سلێمانی لێفە درووبووم بەو خوایە ئەوەندە تەقەڵم لە لێفە نەداوە تۆ ئەوەندە تەقەڵت لە لەشی من دا. ڕەفە

شەل هاتە هۆڵندا هەرکچێکی دەدیت دەیگوت گولاڵە چۆنی، پێش ئەوەی بگاتە هەندەران ساڵی ١٩٩٢ لە قەڵای هەرمۆتە (٥) هەزار پێشمەرگەی هێزی (٧) مەشقیان دەکرد ئامیر هێز (رەهبەر سەید برایم) بوو، رەفە شەل خۆی گاڵتەچی وخۆشە، کاتی مەشق هەندێ لە برادەرانی خۆی کە پێشمەرگەبون مەشقیان دەکرد هاواریان دەکرد:

**ئێمەلە فەوجی فەلیـــن**

**پێشمەرگەی رەفە شەلین**

رەفە شەلیش ڕادەوەستا بە پۆزەوە دەیگووت:

**بەسە بەسە پێی نـاوێ**

**رەفە پێشمەرگەی ناوێ**

## ڕیفراندۆم

١٥١. لە ٢٠١٧/٩/٢٥ ڕیفراندۆم ئەنجامدرا ٩٢,٢٧٪ دەنگی بەڵێ بوو جا پێشتر هەندێک وردە شیعر ودروشم هەبوون بۆ پڕوپاگەندەی ڕیفراندۆم!

د.نەوزاد یەحیا باجگر شیعرێکی دارشتبوو بەو شێوەیە:

**نییە لە مەمکت خۆشتر هەی دۆم**

**جـــــــگە لـــە ڕیـــفراندۆم**

یان دەیانگووت:

# ئەگەر نەڵێین بەڵێ
# دەمانبەنەوە زەڵێ
## یان: ریفراندۆم گانی بە کۆندۆم

### چۆن نایکەین!

١٥٢. شۆڕشی ئەیلول بەیارمەتی وپشتیوانی ئێران وشای ئیران هاوکاری دەکرا، کە پێکهاتن شا و سەدام شۆڕشی ئەیلول هەرەسی هێنا، زۆرجار لە کوردی ڕۆژهەلاتیان دەپرسی بۆ شۆڕش ناکەن وەک شۆڕشی ئیمە وشۆڕشی ئەیلول وشۆڕشی نوێ وشۆڕشی گولان! ئەوانیش دەیانگووت ئەگەر (شا) ڕەزای لەسەر بێ چۆن نایکەین حەتمەن دەیکەین!.

### شۆڕشە یان شەترەنجە

١٥٣. حەسەنی شیرین لە سلێمانی هەر پارتی ومەلایی بوو سەرەتای شۆڕشی نوێی پێیان گوت خەڵک چۆتە دەرێ بۆتە پێشمەرگە بۆ شۆڕش، ناوی هەڵگیرسێنەرانی شۆڕشی نوێیان بۆ هەڵدەدا دەیگوت ئەمانە نانا ئەوانی دی کێ چۆتە دەرێ، مەبەستی ئەوانەی پارتی بوون، گوتیان وەڵڵا عەبدول مەلیک ووەزیرە کەچەڵ، حەسەنی شیرینیش گوتبووی: توو شەرەفتان ئەوە شۆڕشە یان شەترەنجە!!

## کەڵەشێرم ڕۆ

١٥٤. ئـاڵای شـۆڕش بـە (ئـاش) دەنـاسـران پەیوەندییان لەگەڵ (پ.د.ک) هەبوو چونکە لە (ی.ن.ک) جیابووبوونەوە ئەو کاتی ئیدریس بارزانی کۆچی دوایـی کرد هـاوڕێ عادل وەک سەرپەرشتیاری (ئاش) نیشان دەدرا بۆیە چووبوو پرسەکەی هـاواری دەکرد بەداخەوە کاک ئیدریسی جوانەمەرگ پشتمان شکا هەی ڕۆ باوکە ڕۆ کەڵە پیاوم ڕۆ، کەڵە شۆڕشگێڕم ڕۆ، سەرەنجام گوتبووی هەی (کەڵەشێر)م ڕۆ وای دەزانی کەڵ بۆ شێریش بەکاردێت ئیتر ئەوەی لە پرسەکە بوو پێکەنی بوون.

## مەلا چۆلەکە

١٥٥. پاسۆک چەند کەسێکی گرتبوو لەپیاو خراپانی بەعس لە ساڵی ١٩٨٠ بۆیە حکومەتی بەعس داوای گفتوگۆی لێکردبوو کە ئاڵوگۆڕی بەندکراوانی پێ بکات پاسۆکیش بە هەموو کەیفی خۆی یەکێکی خۆی کە نەسەرکردایەتی بوو نەهی بابەتی گفتوگۆ بوو، ناوی (مەلا چۆلەکە)بوو جا شێخ مەنسووری حەفید گوتبووی ساڵی ١٩٧٠ مەلا مستەفای بارزانی بەو هەموو گەورەیی خۆی گفتوگۆی لەگەڵ بەعس وبەغدا دەکرد کەچی پاسۆک لە ساڵی ١٩٨٠ مەلا چۆلەکە گفتوگۆ لەگەڵ بەعس دەکات کە نێوانیان ئاسمان ڕێسمانە!!

## (قەل وقبووڵی)

١٥٦. شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوو، زۆر قسە خۆش ونەوسن بوو حەزی لە قبووڵی بوو بۆیە دەیگووت:

**تەحتە تەل وفۆکل تـــــەل**
**قبووڵی وبامیە وگۆشتی قەل**

## سێ حزب وچوار ئینشیقاق!

١٥٧. شێخ مەنسووری حەفید ئەفسەر وتێکۆشەرێکی دیاری کوردایەتی بوو لەشۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەشداربوو، دەیگوت شۆڕشی ئەیلول ئاش بەتاڵی کرد، بەڵام شۆڕشی نوێ بەکەڵکی ئاش بەتاڵیش نایە، کێ بیکا!! وەک شۆڕشی پێشوو، پۆلای شێخ مارفی بەرزنجی چوار حزب وجیابوونەوەی دیبوو بەشداربوو لیژنەی تەحزیری پارتی بووە، شیوعی بووە، سۆشیالست بووە، جا لە بارەگا لە ساڵی ١٩٨٠ باسی بارودۆخی نالەباری کوردستانی کردبوو، شێخ مەنسوری حەفیدیش گوتبووی باسی وەزعی چی دەکەی بۆ خۆت سێ حزب وچوار ئینشیقاقت لەدەست تۆپیوە.

## ئەو دیوارە بڕوخێ!

١٥٨. خۆپیشاندان لە هەڵەبجە دەکرا ساڵی ١٩٨٢ دژی حکومەتی بەعس هاواریان دەکرد بڕوخێ، بڕوخێ، ئەندامێکی بەعس چاوی سوور دەکاتەوە، بەیەک لەو خۆپیشاندەرانە دەڵێ چ بڕوخێ، کابراش دەترسێت دەڵێت: ئەو دیوارە بڕوخێ بڕوخێ!.

## وامزانی جگەرە بە قینگ دەکێشی!!

١٥٩. فەتاح کاویانی تێکۆشەرێکی کوردی ڕۆژهەلات بوو ئینگلیزیزان وقسە خۆش وئەندامی دەفتەری سیاسی (حدکا) حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو واتە ئەندامی (م.س) ی بوو، پیاوێکی خۆش ورێز لێگیراو بوو، جارێک پێشمەرگەیەک بە ناوی (وەستا ڕەسول) جگەرە دەکێشێ، وەختێ فەتاح کاویانی دەبینێ و پێشمەرگەکە لەڕێز وشەرمان، جگەرەکە دەباتە پشتەوە، دەستی جگەرەکەی لە پشتەوە دەبێ، فەتاح کاویانی دەیبینێ.. جگەرەکەی بردۆتەوە پشتەوە پێی دەڵێ وەستا ڕەسول جگەرە دەکێشی، ئەویش دەڵێ جاربەجار دەیکێشم، فەتاح کاویانیش دەڵێ وامزانی بە قینگ جگەرە دەکێشی نەک بەدەم.

## بارزان مەلا خالید

١٦٠. پاش هەرەسی ١٩٧٥ خەڵکانی ناو شۆڕش گەڕانەوە، دوورخرانەوە ئەوانە کەوتنە فەلووجە گوندی (باعا گول) محسین مام یەحیا و بارزان مەلا خالید وعەلی رەسول وشێخ کەریمی هیرانی وئەمیری حەمە غەریب، ساڵی ١٩٧٦ لەوێ ئەمیری حەمە غەریب ژن دەهێنێ باوکی بۆ ئەو بۆنەیە سەردانی دەکات وپێی خۆش دەبێت دەڵێ جارێکی دیکە نایەمەوە بۆیە بارزانی مەلا خالید لەسەر زاری حەمە غەریب دەڵێ:

**ئەمیر چیتر نایەمەوە فەلووجە**
**بۆناو جەرگەی هێلکە وجووجە**

هەر لەوێ بارزانی مەلا خالید پارچە شیعرێک دادەنێ بەو شێوەیە:

**دەبا گوڵەکەی بەرگی هۆیدای ڕەنگین**
**دەبــــــا بڕژێتن لە عێراقی خوێنین**
**دەبــــــا تەڵەکەی بەکرۆکەی زۆردار**
**کپ کــــــا لە عێراق قاقای پێکەنین**
**ڕۆلەکــــــانم ڕۆلە لێزمە ڕۆڵە لێشاو**
**گەڕاینەوە بەسەرشۆڕی بەرەو ئۆردوگای داگیرکراو**

## دەلۆی کۆنکان

١٦١. دلاوەر ئەحمەد مەجید ساڵی ١٩٧٩ لێپرسراوی ناوچەی بازیانی (ی.ن.ک) بوو لە سنووری هەرێمی قەرەداغ! پێشمەرگەیەک هاتبوو شەرمی دەکرد دابەش بێ بە ماڵان ونان بخوا وبنوێ، دلاوەر بانگی دەکات دەڵێ: ئەوە پێشمەرگایەتییە نە هۆتێل و نە چێشخانە نییە دەبێ لە ماڵان نان بخۆین ولەو دەشت ودەروچیایە لەمزگەوتان جارجارە لە ماڵان بخەوین، نابێ وا، پێی دەڵێ خەڵکی کوێی؟ ئەویش گوتبووی خانەقین! دلاوەریش گووتبووی سەلامەت بێ منیش بەرەسەن خانەقینم، کابرای پ.م خۆشحاڵ بوو گوتی کام عەشیرەت دلاوەریش گوتبووی (دەلۆ)

یم، کابرای پ.م گوتی حەیف وەڵڵا بابایان کوشتووم، دلاوەریش گوتبووی بەڕاستتە کاکە من دەلۆی قەرەی کۆنکان دەڵێم وئەگینا بە ئەسڵ سلێمانیم!

## خزمایەتی

١٦٢. دلاوەر ئەحمە مەجید خۆش و دەم بەپێکەنین وبەزەوق بوو ڕۆژێکی شاهۆ لێی دەپرسێت خەڵکی دیکەش لێ دەپرسن چ عەشیرەتی ئەویش دەڵێ: عەشیرەتی فلیپین ی بەئەسڵ ژن وژن خوازیمان هەیە لەگەڵ کۆنکۆرد تۆشیبا، شاهۆش دەڵێ ئەو عەشیرەتەم نەبیستووە باشە لەگەڵ عەشیرەتەکانی دیکە خزمایەتی ودۆستایەتیتان هەیە دەڵێ: بەڵێ لەگەڵ فایەقاغا هەزارکانی و لالەسەرحەد ئەمانە شاهۆ دەڵێ: بەڕاستی خۆشەویستی!!

## کەواتە

١٦٣. کۆنفرانسی محلی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو لە ساڵی ١٩٨٣ لە گوندی دێلێژە، مامە قالە پ.م بوو لەناوەندی کۆمەڵە دەپرسێت ئەرێ کۆنفرانس چۆنە وچییە؟، م.محسین عەلی ئەکبەریش دەڵێ یەک مەدحی ئەو ئەندامە دەکاتن ودووکەسیش ڕەخنەی لێ دەگرێ، مامە قالەش دەڵێ: کەواتە یەکێک فووی تێ دەکا ودووکەسیش فشی دەکەنەوە!!

## ئەوەی دەڕوا

١٦٤. لە زەمانی شاخ ورۆژگاری سەختی پێشمەرگایەتی لە شۆڕشی نوێ، گۆشت خواردن کەم بوو، ئەو دەم مەحمود خۆشناو وشێخ عەلی شێخ حمە ساڵح لە سکرتاریەتی مام جەلال بوون، مام جەلال داوەتیان دەکات بەمریشک، ساڵی ١٩٨١ خۆی داوەتەکە مریشکێک بووە، یەک مریشک پێشتر مام جەلال دەڵێ با فێڵێک لە مەحمود خۆشناو بکەین بزانین بە ملەقۆتەیەک یان باڵێک یان قوونە جۆرەیەک ڕازی ناکەین، هەرچەند خۆشناوە بەڵام بەخوا فێڵی لێ ناکرێ، کە مریشکەکە دەهێنن مام جەلال دەڵێ مەحمود خۆشناو چ دەخۆی؟ ئەوەی دەقرێ واتە(ملەقۆتە)، یان ئەوەی دەفرێ واتە(باڵ)، یان ئەوەی دەترێ واتە(قونەجۆرە)، مەحمود خۆشناویش دەڵێ ئەوەی دەڕوا ڕێ دەبڕێ!! واتە (ڕان) مریشکیش ڕان وسینگە، مام جەلال دەڵێ نەمگووت فێڵی لێ ناکرێ!.

## خۆیم بۆ نادەیە

١٦٥. مام ڕۆستەم لە سەرەتای شۆڕشی نوێیەوە پ.م بوو، لە هەڵگیرسێنەرانی شۆڕشی نوێ بوو، لە شۆڕشی ئەیلوولیش پ.م بوو، لە دوو شۆڕشان خۆی بە دەستەوە نەداوە! بە هۆی خەبات وپێشمەرگایەتییەوە لە ژن هێنان دواکەوتبوو ئەو دەم ساڵی ١٩٧٩ فەرماندەی کەرتی چواری جەباری بوو! لە ماڵێک

دەبێ کچێک دێتە ژوور بەخێرهاتنی دەکات باوکی کچەکە دەڵێ: بۆت بە ژن دەدەم. مام ڕۆستەمیش دەڵێ: بۆ بۆم بەژن دەدەی خۆیم بۆ نادەیتێ ئەرێ خوشکمە؟ شیرمان پێکەوە خواردووە! پێک ناشێین دە ئەوم بدەیە!!.

## دەست بەگیرفانتەوە بگرە!

١٦٦. لە شەڕی ناوخۆدا لەنێوان یەکێتی وپارتی دا ساڵی ١٩٩٧ لە دێگەڵە لێپرسراوی (ی.ن.ک) دەڵێ گرتنەوەی هەولێر ئاسانە وەک ئاو خواردنەوە وایە وا لە باخەڵمدایە، ئەو لێپرسراوە بەڕێزە لەسەر ئاوەکەی دێگەڵە دەموچاو دەشوا وخۆی دەچەمێنێتەوە بەرزانی قالە خەڵووز ئەکتەر وقسە خۆش وبەپەلار بەکاکی لێپرسراو دەڵێ: دەست بگرە بەگیرفانتەوە، نەک شاری هەولێر بکەوێتە ناو ئاوەکەوە!

## چاپەمەنی یان پاچەمەنی!

١٦٧. ساڵی ١٩٧٩ دەزگای ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک) لە زەڵێ بوو (فازیل کەریم) مامۆستا جەعفەر (ئەندامی م.س)ی (ی.ن.ک) لێپرسراوی ڕاگەیاندن بوو، چاپخانەیەک هەبوو، دەبوو هەموو بە (پاچ) جێی بۆ خۆش بکەین، تاوەکو کاری چاپەمەنی پێ ئەنجام بدەین، پێشمەرگەیەک لە ڕاگەیاندن بوو، بە ناوی (بەهادین عەلی

نەسیم) هێندە بە پاچ کاری کردبوو بۆ چاپەمەنی بۆیە دەیگوت توخوا ئەوە چاپەمەنییە یاخود پاچەمەنییە، ئەوە چاپخانەیە یان پاچە خانەیە، پاچەخانە با، گیپە و سەروپێمان لێ بخواردایە!

## ئێرە دەنگی...

١٦٨. شێخ تالیب لە ساڵی ١٩٧٦ پێشمەرگەی دڵسۆزی کورد وکۆمەڵە بوو، لە بارەگا لیستێکی هەڵواسی بوو گەر مریشک با دەینووسی (نیسکێنە) بۆ ئەوەی مێوان خۆی بەعەردی دا نەدا وبمێنێتەوە، لێیان بخوات هەر فلمێکی دیبا دەیگوت بە کتێب خوێندومەتەوە باسی دەکردا لە کۆنفرانسی کۆمەڵە لە مالیمۆس خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە پشکۆ ناکامیش بەسەری هەڵدەڵێ دەڵێ گوندبەگوند دەگەڕا تسجیلی کۆبوونەوەکانی لە هەموو ماڵێک هەیە کاک نەوشیروانیش دەڵێ کوڕی قەندیلیشە: دوایی دەرنەچوو بەسەرکردایەتی شێخ تالیبیش دەڵێ: مردن سەر شۆڕی بۆ ئەوانەی خیانەت دەکەن و ڕاستگۆنین لەگەڵ قسەکانی بە حەماسەت و هاوارەوە و دەنگ هەڵدەبڕێ، پشکۆ ناکامیش چونکە لە ئێستگەی گەلی کوردستان بوو هاوار دەکا دەڵێ: ئێرە دەنگی گەلی کوردستانە!!

## بێ چەک چۆن وا قارەمان بووە

١٦٩. پێشمەرگەیەک بە ناوی (ح.ب) یەکێتیی بوو دوایی بوو بە شیوعی، لە شەوێک بەشیوعیەتی گیرا لە گوندی (بەکربایف) چەندان شەهید کران، دوای (ح.ب) بە چەکەوە گیرابوو لە موسڵ لە سێدارە درا و شەهیدکرا، مام ڕۆستەم بە هاوڕییانی حزبی شیوعی دەڵێ: ئەرێ (ح.ب) چی بەسەر هات! هاوڕێیانی حزبی شیوعیش دەڵێن پیاوی وا قارەمان ومەرد وئازانەبووە، هێندە بێ منەت چووە بەردەم پەتی سێدارە، بەهوتافی شۆڕشگێڕانە ومەردانە!! مام ڕۆستەمیش دەڵێ قارەمانی چی ئەوە بە چەکەوە گیرا. ئەو بەچەکەوە چی پێنەکرا و گیرا بەبێ چەک خێرە وا قارەمان بووبێت.

## لە کام گرد حەرەس بم

١٧٠. مام نامق کانی کەوەی گەرمیانی پیربوو لای مام ڕۆستەم پ.م بوو خۆی بەلێپرسراوی هەموویان دەزانی مام ڕۆستەم، سالآنی ١٩٨٠-١٩٨٥ دەڵێ پیرە بە تەمەنە حەرەسیاتی (ئێشگری) بانەگرێ بۆی دامەنێن ئەوانیش پێشمەرگەکان پێیان ناخۆش بوو بە حەرەسیات دایان دەنا ئەوسا بەڕۆژیش حەرەسیات هەبوو، جا مام نامق کە بە حەرەسیات دادەندرا دەچووە کن مام ڕۆستەم کە لێپرسراویان بوو، دەیگوت مام ڕۆستەم ئەوە حەرەسم ئایا لەو گردی حەرەسیات بگرم یان

لەولا بەرزتر وزاڵترە مام ڕۆستەمیش دەیگوت ئەمە کێ بە حەرەسی داناوە بەو بیانووەحەرەسیاتی نەدەگرت ونەدەچوو.

## من کوشتوومە

١٧١. مام نامیق کانی کەوەی گەرمیانی هەروەک پیر و شارەزای کێشەی عەشایەری بوو خۆشی تووشی کێشەیەکی کوڕەکەی بوو بوو جا گەر شەڕ وهێرش وچالاکییەک هەبا هی جاشان با دەیگوت یەک فیشەکم لە تەوقی ناوچەوانی عەدەد جیهازەکە دا (تومەز عەدەد جیهاز عەرەب بوو)گەر عەسکەر وقوە خاسە بووایە دەیگوت یەک فیشەکم بەخەسار نەچووە هەموویم لە گۆشتی داوە ونیشانەم پێکاوە!! مام نامیق لەکەرتی چواری جەباری بوو لە هەرێمی (٥) لە ساڵی ١٩٧٩ شەڕێک بوو لە گوندی (ژاڵەی بەردەربەند) پێشمەرگەیەک لەو شەڕە هەڵهاتبوو نەهاتبوەوە پاش هەفتەیەک ئەمجا هاتبۆوە، مام ڕۆستەمیش محاسەبەی دەکات، دەڵێ بۆ هەڵاتی ونەهاتیتەوە پێشمەرگەکە، وای دەیگێڕێتەوە کە چۆن شەڕی کردووە، چەند کەسی لەو شەڕە کوشتووە! مام نامیق لەو شەڕە بەشدار بوو بۆیە لێی دێتە جواب دەڵێ ناکا بڵێی عەدەد جیهازەکەش من کوشتوومە! دلاوەر ئەحمەد مەجیدیش دەڵێ نا نا ئەوە هی تۆیە ئەو هەر جاشی کووشتووە! هەموومان دەزانین عەدەد جیهازەکە عەرەبە مام نامیق کوشتوویەتی! مام نامیقیش دەڵێ: چوزانم!!.

## هینەکەت چۆنە؟

١٧٢. (ش.ت) لە شەڕێک بریندار بوو بە خاوەخاو قسەی دەکرد فیشەک بە کەللەی سەری کەوتبوو! ژنی هێنا، دلاوەر ئەحمەد مەجید لێی دەپرسی لەگەڵ هینەکەت چۆنی؟ (ش.ت) دەڵێ R.B.G یە، هەمووجار دلاوەر ئەحمەد مەجید ئەو پرسیارەی لێدەکرد وناوبەناویش دەیگوت ساچمەزەنە ئیتر وردەوردە لەکورتی دا بوو لە R.B.G وهاتە سەر ساچمەزەن دەیگوت جارجار دەجوولا وتەقە دەکات، وەڕەزبوو بوو تاقەتی جاران نەما بوو دەیگووت بەخوا دلاوەر وەک جارانی نەماوە ئەم ژنەش تێر نابێ بەو خوایە هێندە حەزی لێیە ئەو ژنە، بەشی هەموو ئاوایی دەکات!! وای لێکردبوو تاقەتی نەمابوو، دەروەستی نەدەهات چەکەکەی فیشەکی تێدا نەمابوو.

## بۆ ڕۆیشتن

١٧٣. مام ڕۆستەم ف.کەرتی چواری جەباری بوو لە هەرێمی (٥)ی قەرەداغ مستەفا چاوڕەش فەرماندەی هەریم بوو، جارێک لە ساڵی ١٩٧٩ لەسلێمانی گرووپی D.D.T دەنێرێ لە گوندی (دێلێژە) دەبن ئەوسا بارودۆخ زۆر خراپ بوو شەڕی عێراق وئێران بوو، حکومەتی بەعس زۆر بەهێز بوو خەبەریان لێ درابایە وبیانزانبوایە پێشمەرگەیەک لەهەر کوێیەک با، هێرشی دەکردە سەر وپۆلە هەلیکۆپتەرێکی دەناردە سەریان، بۆیە مام ڕۆستەم بەو گرووپە D.D.T یە دەڵێ تا ڕۆژئاوا دەبێ مەڕۆن

گەر کاری وەشاندن ودەرمان پێوەکردنتان تەواویش بێ مەڕۆن، نەبادا یەکێکتان تێدابێ خەبەرمان لێ بدات تووشی شەڕێکی نەخواستراو بین ئێمە هەمووتان ناناسین، نالێین خراپن بەڵام با ئەو ڕووداوە ڕوونەدا تا درەنگ مەڕۆن! گرووپی D.D.T تەواو دەبێ ڕۆژ زۆری مابوو سوار بوو بوون بڕۆن بەڕێ کەوتبوون بۆیە مام ڕۆستەم لەدوویان دەنێرێ ودەیان گەڕێنێتەوە پێیان دەڵێ ئەی پێمان نەگوتن مەڕۆن، بۆ ڕۆیشتن؟ مام نامیق کانی کەوەی گەرمیانیشی لەگەڵ بوو، مام نامیق دەیەوی جنێویان پێ بدا بە تورەییەوە دەڵێ بۆ ڕۆیشتن مام ڕۆستەمیش دەڵێ مام نامیق نەکەی خزمی خۆمانن، مام نامیقیش لەسەرەخۆ دەڵێ ئەرێ باوکی باوکم بۆ ڕۆیشتن، چاوەکەم بۆ ئێوەمان بوو.

## کەمپووت فرۆش

١٧٤. دوو شاعیری شۆڕشگێر وکەسایەتی لە شاخ و ڕۆژگاری سەختی شۆڕش ڕۆڵیان هەبوو مامۆستایان (ح.ب و و ناسری حەفید)(ناله) لە بۆ ڕێزگرتن دایان نابوون بۆ ئیدارەی گشتی دوکانێکی کەمپووت فرۆشیان بۆ دانابوون باوکی (ح.ب) زانی بووی وتبووی گەر دوکانداری دەکرد دوکانێکە گەورەم لەناو شاری سلێمانی بۆ دادەنا (کەمپووت)، (خواردن وخواردنەوەی ناوقودوو)بوو بفرۆشن، جا (ح.ب) بە زۆر کەسی دەگووت ئەمە خۆ فرۆشە فلان کەس خۆ فرۆشە، ڕۆژێکی (ناسر حەفید)، (ناله) پێی دەڵێ: جەنابیشت کەمپووتفرۆشی!!.

## کام پشکۆ

١٧٥. تازە ئێستگەی دەنگی (ی.ن.ک) دامەزرابوو، هەندێ لە ئامێرەکانی ڕاگەیاندن لە زەڵێ کە مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد) لێپرسراوی بوو بەیاننامەیەکیان بڵاوکردبۆوە هانی خەڵک بۆ خۆپیشاندان وڕاپەڕینی جەماوەری لە بەیاننامەکەدا واهاتبوو (پشکۆی جەماوەر لە گەشانەوەدایە) مام جەلال بەو بەیاننامە تووڕە بوو چونکە مەسەلەیەکی سیاسی وا وبڕیارێکی لەو شێوەیە پێویستی بەوردبوونەوە وهەڵسەنگاندن وڕابەڕایەتی دەکاتن بۆیە پێیان دەڵێ پشکۆی چی کام پشکۆ؟ پشکۆی ئیعلام (پشکۆ سەعید ناکام) هەموو ڕۆژێ دەڕوخێ ئەمن کۆڵەگەی دەدەمە بەرێ کام پشکۆیە بە چۆڕە میزەکی دەکوژێتەوە!!

## سەوادم نییە

١٧٦. مام ئەحمەدی شێنێ مێردی پوورە کەسکێ بوو تاکە ماڵ بوون لە (زەڵێ) لەنێوان بارەگای لقی سێ (ی.ن.ک) ودەزگای ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک)دەژیان، مام ئەحمەد بەختەوەر بوو جگەرەی زۆر دەکێشا ئەوسا هەڤاڵ کوێستانی لە دەزگای ڕاگەیاندن بوو، پێی گوتبوو مام ئەحمەد هێندە جگەرە مەکێشە بۆ تەندروستیت خراپە مام ئەحمەدیش گوتبووی بەخودا ئەمن هیچ خراپەم لێ نەدیوە بۆ خراپە؟ پێیان گوتبوو تووشی نەخۆشیت دەکات وتەمەنت کورت دەکاتەوە، مام ئەحمەد گوتبووی چۆن تەمەن

کورت دەکاتەوە!! پێیان گوتبوو لەباتی ئەوەی ٩٠ ساڵ بژیت ٨٠ ساڵ دەژیت: مام ئەحمەدیش گوتبووی ئینجا بەخودای ئەمن (سـەوادم) نییە واتە خوێندەواریم نییە فەرقی هەشتا ونەوەت ناکەم!!.

## پەنابەری شاخ

١٧٧. هۆمەر شێخ مووس دەستەی دامەزرێنەری (ی.ن.ک) وئەندامی م.س بوو لە سەرپشکی خەتی گشتی، (ئەگنێتا)ی خێزانی کە سویدی بوو لەگەڵ خۆی هێنابوو، لەو ڕۆژگارە سەختە لە خراپیی نێرزەنگ وتوژەڵە لەناو خێوەت وکەلەکەبەرد دەژیان وازیان لە (سوید) هێنابوو لەو شاخ وداخانە خەباتیان دەکرد لە ساڵی ١٩٧٩، لە سوید باروگوزەرانیان خۆش وباش بوو، جارێک مام جەلال وهۆمەر شێخ مووس لێک دەتۆرێن وناگەنە یەک بۆیە هۆمەر شێخ مووس نامەی دەست لەکارکێشانەوە دەنووسێ ودەچێتە لای مولازم عومەر کە ئەوسا مولازم عومەر ئەندامی م.س ولێپرسراوی مەکتەبی عەسکەریی (ی.ن.ک) بوو، هۆمەر شێخ مووس دەڵێ هاتووم داوای پەنابەری دەکەم وەرم بگرن، مولازم عومەریش دەڵێ: قوڕبەسەرمان خەڵک لێرەوە لە هەموو شوێنێک داوای پەنابەری لە سوید دەکاتن، کەچی جەنابت لە سویدەوە هاتووی دەتەوێ لەو شاخ وداخەی بن ئەو خێوەتانە داوای پەنابەری لە ئێمە بکەیت!!.

## چەپ وڕاستی نییە

١٧٨. ساڵی ١٩٨٠ كەرتی دەشتی كۆیە مەندە وفەرەج لە دۆڵی خەلەكان لێپرسراوی مونەزەمەیەكیان گرت بەناوی (عەدنان) وڕەوانەی سەركردایەتییان كرد، لەوێ بڕیاری ئیعدامی شۆڕشگێڕانە درا لە تەختایەتیەكەی توژەڵە لەبەرچاوی خەڵك وپێشمەرگە، گوللە باران كرا، كێشەكە لەوەدا بوو گرووپێك بەناوی حزبی بەعسی یەساری بارەگایەكی بچكۆلەیان لە خڕێ نێرزەنگ بوو، بارەگای سەرەكییان لە (شام)بوو هەر بەعسییەك دەگیرا ئەوان لەسەری بەجواب دەهاتن دەیانگوت هی ئێمەیە، هەموو بەعسییەكی عێراقیان بەڕێكخستنی خۆیان دەزانی ئەو بەعسییە یەسارییانەی ئەوێ داوایـان دەكـرد نـەك بكوژرێ بەڵكو بەربدرێت، جا مشتومڕ كەوتە ناو بارەگاكانی (ی.ن.ك) ئایە بەعس چەپ وڕاستی هەیە هەموو شۆڤێنین دژ بەنەتەوەی كوردن یەكێك دەیگوت وەك كڵاشی هەورامی چەپ وڕاستی نییە یان دەیانگوت بەعس هەر بەعسە چەپ وڕاستی لەكوێ بوو هەموو بەچكەی یەك سەگن!!.

## ڕیش وبەسەر سفرە كەوتن

١٧٩. مام جەلال كەیفی بە ڕیش نەدەهات جارێك لە گوندی خەتێ داوەت دەبن كوڕێكی ڕیشدار سفرەیان بۆ ڕادەخا خزمەتیان دەكات مام جەلال پێی دەڵێ ئەو ڕیشە چییە كوڕە ڕیشدارەكە

دەڵێ کەیفم پێی دێت مام جەلال دەڵێ: ڕیش چ جوانییەکی تێدا نییە تا کەیفت پێ بێ! مام جەلال لەو داوەتە دەڵێ: با شتێکتان لەسەر ئەو مەسەلەی ڕیشە ودکتۆر کەمال فوئاد بۆ بگێڕمەوە: دەڵێ ساڵێکیان لەگەڵ د.کەمال فوئاد ئامادەی کۆنفرانسێکی جیهانی بووین کە پەیوەندیی بە مافی گەلانەوە هەبوو، پیاوێکی کەڵەگەتی چوار شانەی ڕیشدار هاتە هۆڵی کۆنفرانسەکە، د.کەمال فوئاد کابرای دی و گوتی ئەو پیاوە ڕیشدارە زۆر (کەرە)، ئەمن گوتم ئاخر بە چ هەقێکی وا دەڵێی، زۆر نەجیب وماقووڵ دیارە گوتی (غەڵەتی) کۆنفرانس دەستپێکرد، کابرای ڕیشدار چووە پشتی مایکرۆفۆن دەستی کرد بەقسان وسەرەتا، قسەی زۆر جوان وڕێکوپێکی کردن! بە د.کەمال فوئادم گوت نەمگوت ئەو پیاوە پیاوێکی ماقوڵە، د.کەمال فوئاد گوتی ئێستاش هەر دەڵێم کەرە!! سەرەنجام قسەی کابرای ڕیشدار تەواونەبوو هەر چەنەی دایە بەدرێژدادڕی کردی بەهەراو بۆڵە بۆڵ، لەناو هۆڵ، خەڵک چوونە دەر لەهۆڵ کابرای ڕیشدار هەر نەی دەبڕیەوە د.کەمال فوئاد پێی گوتم پێم نەوتی ئەو ڕیشدارە زۆر کەرە!! کە سفرەی نایلۆن ڕادەخرا گەنجە ڕیشدارەکە بەگۆرەوەیەوە بەسەر سفرە دەهات ودەچوو، مام جەلال پێی دەڵێ ڕۆڵە بەسەر سفرەکەدا هاتوچۆ مەکە گۆرەوییەکانت پیس دەبن، زۆرجار میوان لەکاتی نان خواردن وسفرە داخستن تووشی ئەو حاڵەتە دەبن، کابراش دەڵێ قاچم بە نوێژە، قاچ وگۆرەویم خاوێنە چ قەیدیە. مێوانێک

گووتویەتی ئاخر بۆ قاچ وگۆرەویت دەخەیتە ناو دەممان! مام جەلال دەڵێ ئاخر گۆرەوییەکەت پیسە، گەنجە ڕیشدارەکەش دەڵێ: گێ مەدەیە مامە منداڕەکان بۆم دەشتواتن، مام جەلالیش دەڵێ ڕۆڵە ئەتۆ دەبا، ڕیشت هەر هەبا.

## (شەڕە سەگ)

١٨٠. نەوشیروان مستەفا سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان وجێگری سکرتێری گشتی ساڵی ١٩٨٣ لە (باوزێ) دەبێ بۆ گەشت ومێوانداری سەردانیان دەکات! دەزگای ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک) وپەخشی ڕادیۆی لێ بوو! فەرماندەیەک (ع.و)لەڕووی لوتفەوە بەکاک نەوشیروان دەڵێ دوو گۆڵە سەگی چاکی لێیە، بۆ زاخاوی مێشک خۆشە بۆ شەڕە سەگیان پێ نەکەین، هێندە خۆش وپێ کەنیناوییە! شەڕە سە لە هەموو بەزمێکی خۆشترە، زەوقی تێدایە، کاک نەوشیروان دەڵێ بۆ وەختێکی تر پێی خۆش نابێ! ڕوو لە هەڤاڵ کوێستانی دەکات ودەڵێ، خەڵکی لە ولاتان بۆ دڵخۆشکردنی مێوانەکانیان تیپی مۆسیقا وسەما دەهێنن کەچی لێرە شەڕە سەگمان بۆ دەهێنن!.

## حەمەی حزب وڕەخنە لە خۆگرتن

١٨١. سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ بوو، حەمە حزب بزووتنەوەی سۆشیالیست بوو، گلەیی کردبوو لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی

کوردستان وبووه کێشەو وای لێهات کۆبونەوەی (م.س) ی (ی.ن.ک) ئەنجام نەدرا لەسەر ئەوەی دەبێ حەمە حزب رەخنە لە خۆی بگرێ وحەمەحزبیش دابوویە کەلی شەیتان و ڕەخنەی لە خۆنەدەگرت، سەرەنجام مام جەلال، هاتە کایەوە و حەمە حزب بە ناچاری سەلماندی لەبەرخاتری مام جەلال چووە بەردەم بارەگا. سالار عەزیز ئەندامی م.س (ی.ن.ک) بوو وەک هۆرەی جافان گوتبووی هۆهۆ کاک سالار کاک سالار ئەوە ڕەخنەم لەخۆم گرت بووی بە پاشا.

## کونەکە وئاوەکە

١٨٢. سەرکردەیەکی کورد لە جولانەوەی کورد لە دەربەندیخان کۆبوونەوەیەکی بەجەماوەری شارەکە کردبوو کە تونێل وبەنداوی ئاوی لێیە، سەرکردەکەش گوتبووی ئەی جەماوەری بەشەرەفی دەربەندیخان دوو بەهرەتان هەیە کە دەسکەوتە یەکیان کونەکەیە و دوەمیان ئاوەکەیە!!.

## پفوو تفوو

١٨٣. لە دۆڵە توو دوو ئەندامی دەزگای ڕاگەیاندنی حزبی سۆشیالیست بارزان مەلا خالید ومحەمەد رەنجاو بوون لە ساڵی ١٩٨٠ ئەوانیش لەنێوان خۆیاندا نێوانیان ناخۆش بوو جا بەسندووقە فیشەک لەیەک ژوور نێوانیان دروست کردبوو

چرایەکیان لێ دانابوو شـەوان کەسیان نەیان دەکـوژانـدەوە، پێشمەرگەیەکیان بەدەستەوەبوو بانگیان دەکـرد چرایەکەی بکوژێنێتەوە ئەویش لەڕقان بەو شێوەیە چراکەی دەکوژاندەوە یەک بەخۆی دەیگوت پفوو وای دەردەبڕی هەر بە (تفوو) دەچوو.

## خۆ تەیارە و تۆپ باران نییە

١٨٤. سالّی ١٩٨٥ (ئاشتی مستەفا) شووی کرد بە پێشمەرگە ئاراس زڕگوێزی، تازەبووک هاتە دەرێ ومامۆستای قوتابخانە بـوو، لـە گـونـدی (کونجرین) کونجی قەناعەتیان بـوو، پاش گفتوگۆی یەکێتی وبەغدا شەڕ دەستی پێ کردەوە، ئاگر دەباری تـۆپ بارانی خەست وسەختی گوندەکەی دەکـات لە گوندی (کونجرین)، (ست ئاشتی) دەترسا ئاراسیش دەیگوت بۆ دەترسی خۆ تەیارە نییە ئەوە تۆپبارانە وای پێ دەگوت وەک تۆپباران کە خەڵک ناکوژێ،!! دوای ماڵیان گواستەوە بۆ (یاخسەمەر) تەیارە بوردومانی دەکرد (ست ئاشتی)یش هەر دەترسا ئەمجارە ئاراس بە هاوسەرەکەی دەگوت مردووت مرێ بۆ دەترسی تەیارە چییە خۆ تۆپباران نییە.

## لەناو ترێیان

١٨٥. لەسالّی ١٩٨٧ لـە داستانی ڕزگـاری تیپی (٣١)ی سلێمانی کەوتبوونە ناو ڕەزە ترێیان، چەند ڕۆژێک بوو هەر

تری یان دەخـوارد، لێپرسراوی ئیدارەیان خـواردن وئازوقە وخواردەمەنییان بۆ نەبردبوون، زۆربەی پێشمەرگەکان هاواریان لێ هەڵسا لێپرسراوی مەڵبەندیان لێ ئاگادار کردەوە، سکاڵایان لەسەر لێپرسراوی ئیدارە بوو، لێپرسراوی ئیدارەیان بانگکرد بۆ خواردن وموعەلەباتیان بۆ نەبردبوون؟ چونکە لە(شەڕ وبەرەن) لێپرسراوی ئیدارە گووتبووی وەڵـلا ٥-٦ بـارە تـری مـان بۆ نـاردوون، پێیان گوتبوو مردووت مری شەڕەکە لەناو ترێیانە چەند ڕۆژە بە تری ئیدارە دەکەن بارە ترێی چیت ناردووە!.

## بۆ ئێمە چین!

١٨٦. زۆر کەس دەبوونە پێشمەرگە ودەچوونە شاخ بێ ئەوەی بزانن کام حزب ولایەنە، عومەر باسام تەوێڵەیی ساڵی ١٩٧٧ تەقە لە فڕۆکە دەکات بە برنەو، بە پاکی وکوردایەتی و بەورەی بەرز پێشمەرگە بوو، مەلا بەختیار لە چەمی هاوار وپەروینە کۆبوونەوەیان پێ دەکات، هێرش دەکاتە سەر (قیادە موەقەتە ومەلا مستەفا بارزانی) عومەر باسامیش بەوەی نەزانیوە دەڵێ: بۆ؟ ئێمە چین تا جنێو بە ماڵی مەلا مستەفا بارزانی و پارتی بدەین دەڵێن ئێمە یەکێتین بۆ بەیانی ڕێک دەبێتە پارتی وپەیوەندییان پێوە دەکات.

## ئەوە تلیت

١٨٧. پێشمەرگەکانی تیپی ٥٧ی سەگرمە لە ساڵی ١٩٨٦ لە گوندێک دابەش دەبن ودەچنە ماڵێک، ژنی ماڵەکە هێندە منداڵەکەی باوەشی هەڵدەپەڕێنێ، لەناکاو ژنەکە بایەکی دەنگداری لێ بەربوو لەکن پێشمەرگەکان ژنەکە بەسەر خۆی نەهێنا وخۆی تێک نەدا ڕووی کردە منداڵەکە گوتی کورم بەقوربانت بم ئەوە (تلیت)!.

## کادیری حزب

١٨٨. کادیری حزب لە شاخ هەمیشە جانتایەک و هەندێ بەیاننامەی پێ بوو ودەگەڕا لەگەڵ ١-٢ کەس بۆ ڕێکخستن و کۆبوونەوە، ساڵی ١٩٨٣ پێشمەگەکانی تیپی ١٥ی شارەزوور (ی.ن.ک) لەماڵە جافەکان دابەش دەبن بۆ نانخواردن، بەڕێکەوت سەگێکی پاڵکەوتوو دەستەکانی لەبن خۆی نابوو تەماشای دەکردن، خاوەن ماڵەکە چغەی لێ دەکات ودەڵێ: چغە چغە ئێژی کادیری حزبی پاڵکەوتووی داوای ئابوونە دەکەی.

## ئەوەی ژێری نێرەکەر بوو!

١٨٩. یەکەم شەڕی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان لە گوندی (قاینجە) بوو لە ساڵی ١٩٧٦، لەو شەڕەدا (ح.ح.غ) بەشدار بوو، شەڕەکە دەستەو یەخەبوو نایب عەریفێک (ح.ح.غ)لە کۆڵ دەکات ودەیگرێ، شەوکەتی حاجی مشیر ڕزگاری دەکات گوللە

لە تەختی نێوچەوانی دەدا ودەیکوژیێ، جا دەیانگوت ئەو نائب عەریفە نێرەکەر بووە، مەحمود گەرمیانیش دەڵێ، ئەو نێرەکەر نەبوو، ئەوی ژێری نێرەکەر بووە چۆن نەتۆقیوە!.

## نە لە برسانە نە لەترسانە!

١٩٠. کاکە حەمەی حاجی مەحمود سکرتێری حزبی سۆشیالیست لەچاوپێکەوتنێک دەڵێ ئێمە لەبرسان ولەترسان لەگەڵ هەڵوێستی یەکێتی وپارتین، مەسعود بارزانی سەرۆکی پ.د.ک ئەو قسەی لەدڵ بوو، کاکە حەمە دەبینێ پێی دەڵێ کاکە حەمە زانیومە قسەیەکی وات کردووە، تۆ پێشمەرگەی کۆنی وفەرماندەیەکی ئازا وقارەمان بووی ترست تێدا نییە، بەئازاو قارەمان بەناوبانگی! واتە ناترسێی، و هەر کەس تۆ ببینێ چونکە کاکە حەمە گەلەک قەڵە و بەخۆوەیە وخەڵک دەزانێ برسی نەکراوی واتە نە لەبرسانە ونەلە ترسانە!.

## حاجی لەق لەق

١٩١. نادر هەرووتی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بوو تابڵێی خواپەرست ودیندار بوو، سەری بچووبا نوێژی نەدەچوو ناویان نابوو نادر لەق لەق، پێیان دەگوت بۆ ناچیە حەجێ هێندە بەدین ونوێژکەری دەیگوت بچمە حەجێ دەبمە حاجی خەڵک پێم دەڵێن حاجی لەق لەق.

## گرنگ مافی کوردە نەک جێگا

١٩٢. لە گفتوگۆی ی.ن.ک لەگەڵ میری ساڵی ١٩٨٤ نەوشیروان مستەفا ئەمین بە وەفدێک دەچنە بەغدا لەناو هەلی کۆپتەر دەبن دەپرسی لە بەغدا لە کوێ دامان دەبەزێنن کابرای ئیستخبارات دەڵێ بەغدا هێندە پێشکەوتووە وەک جاران نەماوە، هێندە گۆڕاوە بیناسازی زۆری تێدا کراوە، لەجێیەک داتان دەبەزێنین لەژیانتان شوێنی وا خۆشتان نەبینیبێ، نەوشیروان مستەفا ئەمین نیگەران دەبێ دەڵێ ئێمە بۆ مافی گەلەکەمان دەچینە بەغدا بە نەدی وبەدیمان تێ مەگە، لەهەر جێگایەک بێ گرنگ مافی کورد بسەلمێنین، من پێش چەند ساڵ هەموو ئەوروپا گەڕاوم، ئەو شوێنە خۆشەی من دیومە ئێوە بەسەد ساڵیش نایگەنێ.

## توخودا ئەوە پەتووە

١٩٣. پێشمەرگەکان لە زەمانی شاخ دابەش دەبوون بۆ نانخواردن وحەوانەوە، پێشمەرگەیەکی تیپی ٥٧ی سەگرمە لە ماڵێک دابەش دەبێ لە زستانی ساڵی ١٩٨٣ پاش نانخواردن داوای پێخەف دەکات بیباتە مزگەوت لەگەڵ پێشمەرگەکانی دیکە پێی بخەوێ خاوەن ماڵەکە پەتووەکی تەنک وەی ئەوانەی ساواری لەسەر وشک دەکەنەوە، پێشمەرگەکەش دەڵێ توخوا ئەو پەتووە بە توتکە سەگی دابدەی بەو سەرمایەی نایتۆپێنێ!

## مەفرەزەی حەیوانات

١٩٤. لەناو سلیمانییاندا نازناو زۆرە، پێشمەرگەیەک بۆ بێستوونی مەلا عومەر باسی مەفرەزەیەکی دەکرد، مەفرەزەکە چوو بۆ چالاکی بۆناو سلیمانی بێستون دەڵێ: ئەو پێشمەرگانە کێ بوون، پێشمەرگەکە دەڵێ: من وکەمال ددان سەگ وجەمال ددان سەگ وسەرداری قالە بەراز و مامە فیلە و تۆفە کەڵەشێر وخولە سەگ کوژ بووین، بێستوون دەڵێ: ئەمە مەفرەزەی پێشمەرگەیە یان مەفرەزەی حەیواناتە لە غاباتیش هەر ئەوانە هەیە.

## بۆ دەبیە پێشمەرگە؟

١٩٥. مام عەلی لەگەڵ حزبی زەحمەتکێشان بوو بارەگایان لە بارزان بوو، لە ساڵی ١٩٨٤ جارێک یەکێکی خەڵکی هەولێر دێتە شاخ و دەیەوێ ببێ بە پێشمەرگە کابرای هەولێری مەیلەوتورکمان بوو، کوردی باش نەدەزانی مام عەلی لێی دەپرسێت بۆ دەبیەپێشمەرگە وچ هۆیەک پاڵی پێوەنای چەک هەڵگری وداوای ئازادی کورد وکوردستان بکەی؟ کابرای هەولێریش دەڵێت لە ڕاستیدا زڕدایکم هەبوو ئازاری دەدام وداغی دەکردم ولێی دەدام خەو وخواردنی لێ حەرام کردبووم لەڕقی ئەو زڕدایکەم دەبمە پێشمەرگە، دوژمنی سەرەکیم ئەو زڕدایکەمە، مام عەلی ڕاست دەڵێت: هەی لە قوزی دایکت بەم باشە، کابرای هەولێری دەڵێ: چی، چی مام عەلی!!

## تۆ بەزیوی!

١٩٦. ئەحمەد عەلی قادر (ئەحمەد ساوار)کۆنە جەلالی بوو، ناسراو بوو بە ئەحمەد ساوار (١٩٣٣-٢٠٠٠)، لە پرسەی شەهید شێخ حەمە سالح ساڵی ١٩٨٤ لە کۆیە مام جەلال دەیبینێ پێی دەڵێ ئێستا ئەتوو چی؟ چ دەکەی، ئەحمەد ساواریش دەڵێ لەمن گەڕێ جەنابت چی، چ دەکەی؟ مام جەلالیش دەڵێ من یەکێتیم وسکرتێری گشتی (ی.ن.ک)م! ئەحمەد ساوار دەڵێ ئەتوو بەزیی (بەزیوی) من هەر جەلالیم!!

## عەگالەکانی عەرەب دەبینم

١٩٧. مامە ڕیشە ساڵی ١٩٨٣ دەیویست لە عەرەبەکان بدات لە دەوار ورەشماڵەکانی عەرەب. لەلای (لەیلان) لە کەرکوک پێشمەرگەیەک هەبوو چاوی کزبوو پێیان دەگوت چاو جوان خۆی ئامادەکردبوو بەشداری شەڕەکە بکات بۆ لێدانی عەرەبان بە پێشمەرگە چاو کزەکە دەڵێن نابێ بێی چونکە چاوت باش نابینێ ئەویش ڕوو لە مامە ڕیشە دەکاتن ودەڵێ: خۆ عەگالەکانی عەرەب دەبینم وحوشتر وگامێشەکانیان دەبینم بۆیە دێم وبەشداردەبم.

## بیگەیەنن!!

١٩٨. شەوانە پێشمەرگە کە دەڕۆیشتن لە کاروانەکە هەر قسەیەک پێویست با دەیانگەیاند، ئەوە نەریت بوو لە

پێشمەرگایەتی. مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی ساڵی ١٩٨٧ دەیانویست لە قەرەداخەوە بەرەو پشتی دەرەبەندیخان بەڕێ بکەون بۆ (سێوسێنان) یەکەم کەس قافڵەچی هەڵوێستێک دەکات دەڵێ: بیگەیەنە بە هاوڕێ ی لێپرسراو ئەوەی بەردەممان یان زەلامە یان ورچە تەقەی لێ بکەم یان نا؟ یەک بەدوای بەیەک دەیگەنین تا هاوڕێی لێپرسراو، هاوڕێی لێپرسراو دەڵێ: با گوو بخوا وبڕوا!!!.

## تاپڕ وR.B.G

١٩٩. پێشمەرگەیەک لە تیپی ٤٣ ئاسۆس، R.B.Gیان دابوویە، دەچێتەوە ماڵێ، دایکی دەیبینێ بە پێشمەرگەکان دەڵێ ئەوە چییە ئەو چەکە داوتانە کوڕەکەم وەختی خۆی تاپڕی پێ بووە سێ جار تاپڕی لەدەست دەرچووە بەفەخری عالەم ئەو لوولە زۆپایەی لەدەست دەرچێ گشتتان دەکوژێ لێی بسێنەوە با نەیتەقێنێ!! ولەدەستی دەرنەچێ!.

## حیسک ونیسک!

٢٠٠. ساڵی ١٩٨١ کۆمەڵێک پێشمەرگە دابەش بوون زۆربەی لایەنەکان بوون لە گوندی (باخەوان)ی قەرەداغ پیاوێک لەوێ دەچێتە گوندێکی دیکە دەڵێ ئیمشەو پۆلێک پێشمەرگە هاتن بۆ گوندی. پێی دەڵێن چی بوون؟ ئەویش دەڵێ (ی.ن.ک) و(پاسۆک)

و حیسک بوون، کابراش دەڵێ ئەی (نیسک) یان لەگەڵ نەبوو کابرا دەڵێ دەم خۆش بەرێ وەڵلا نیسکیشیان لەگەڵ بوون.

## سەی ئەسڵی

٢٠١. مەحمود خۆشناو سکرتێری مام جەلال بوو، مام جەلال زۆرجار دەیگوت ئەو خۆشناوە کڵاوی لەسەری منیش دەنێ، جەمال ئاغای حەکیماغا لەڕاستیدا هەولێری وبادینی وژن ویاپراخ ومامۆستای نەدەحوباند دەیان نوکتەی لەسەر هەولێری دەگێڕایەوە ساڵی ١٩٨٢ مەحمود خۆشناو دەڵێ مامە جەمال گەر مەعاشی ئەسڵیت (٩٩) دینار بێ لە سلێمانی یەک دیناری دیکەت بۆ زیاد بکەن دەبیتە چەند؟ مام جەمال بێ قەزابی ئەبمە سەی ئەسڵی.

## ناوکی کەر لەکوێیە؟

٢٠٢. کادیرێکی سیاسی لەناوچەی شارباژێڕ لەساڵی ١٩٨٤ گەرمەی گفتوگۆی نێوان (ی.ن.ک) ومیری بوو لە بەغدا، کادیرەکە باسی گفتوگۆ وچۆنیەتیی دانوستانی (ی.ن.ک) و بەعسی دەکرد، لە گوندەکان یەک لە دانیشتوانی گوندەکە دەڵێ: مامۆستا پرسیارم هەیە، کادیرەکە وای زانی بوو باسی سیاسەت وکوردایەتیی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی گفتوگۆ دەکا، کادیرەکە دەڵێ فەرموو! کابرای گوندەکە دەڵێ: مامۆستا دەزانی (ناوکی کەر) لەکوێیەتی؟

کادیرەکەش لەسەرخۆ گوتی لەدەستی دایە لەچۆکی دایە ئەوە ناوکی کەرە، کابرای گوندی کە تەمەنی هەبوو ڕیش سپی بوو گوتی ناوەڵڵا نەتزانی (ناوکی کەر) لەسەر پشتیەتی! کادیرەکە دەڵێ چۆن وایە! کابرای گوندی ڕیش سپی دەڵێ: بەڵێ وایە من ڕیشم لەناو کەران سپی کردووە دەزانم وایە، کادیرەکەش دەڵێ: وەڵڵاهی ڕاست دەکا سەروڕیشت لەناو کەران سپی کردووە!.

## بە چ نان بخۆم

٢٠٢. کادیرێکی سیاسی ودیار (ع.ع) گەرمیانی ساڵی ١٩٨٨ لەپاش ئەنفالەکان لە قەڵا بوون، پێشمەرگەیەک تووشی (سیل) بوو بوو، هەر پێشمەرگەیەک کەوچکی خۆی هەبوو گوتی براینە ئەو پێشمەرگەیە تووشی سیل بووە، تکایە کەوچکی ئەو تێکەڵ مەکەن با جیابێ! چونکە دەیزانی هەموومان تووشی نەخۆشییەکە دەبین با کەوچکی ئەو نەخۆشە تووشمان نەکا، پاش نان خواردن کادیری سیاسی دەبینێت هەموو کەوچکەکان لەیەک مەنجەڵن وتێکەڵ وپێکەڵ کراوە کادیرە سیاسییەکە توورە دەبێ هەموو کەوچکەکان دەشکێنێ، پێشمەگەکان دەڵێن بە چی نان بخۆین کادیرە سیاسییەکە دەڵێ بە کێرم!.

## شەھید نەبووم بریندارم

٢٠٤. بەکر چۆلمەکی پێشمەرگەی تیپی (٥٧)ی سەگرمە بوو ساڵی ١٩٨٣ لەشەڕێکدا بریندار بوو گوللە بەر قاچی کەوت نەدەکرا سواری وڵاخی بکەن، ناچار دارە مەیتێکیان هێنا بە برینداری خستیانە ناوی، هێنایانە ئاوایی. دایکی وای زانی شەھید بووە، بەگریان ولەخۆدان وشیوەن بەسەری هەڵدەگوت، بەکر چۆلمەکی گوتی دایە شەھید نەبووم وبریندارم برادەران شەھیدیان کردم دەزانن شەھید دەبم حەزدەکەن بە شەھیدی بمبینن سەرەنجام لەشەڕێکدا شەھید بوو!.

## ڕیش

٢٠٥. ڕیش هێشتنەوە لە شۆڕشی نوێ مۆدێل بوو پێشمەرگەیەکی تیپی (٢٥) خاڵخاڵان ڕیشی دانابوو زۆر درێژبوو، خەڵک لێی دەترسا، د.کەمال فوئاد دەیگوت ڕیش هێشتنەوە سەرەتای کەرایەتییە، جا بەو پێشمەرگەیە دەڵێ ئەو ڕیشە چییە بیتاشە بەسە، کابرای ڕیشدار دەڵێ نایتاشم چونکە ئیسراحەتم کردووە، هەر قسەیەکم دەکرد جاران بەسوعبەت دەیانگووت لەبنی گونت بەین لەکونی قینگت بەین ئێستا دەڵێن لەڕیشت بەین گوو بەڕیشت قینگم ئیسراحەتی کردووە!.

## نازناو

٢٠٦. لە شۆڕشی ئەیلول ساڵی ١٩٦٤ حەمید سەعید عەسکەری کادیر بوو، لەناوچەی قەڵاسێوکە وشێخ بزێنی، خەڵکی گۆپتەپە نارەزاییان دەربڕی بەرامبەری دەیانویست بیگۆڕن، شکاتیان کردبوو، کادیرێکی دیکەیان ڕاسپارد بۆ ئەوەی جێی حەمید سەعید عەسکەری بگرێتەوە، حەمید سەعیدیش چووبوو چی نازناوی گۆپتەپە هەبوو بەنازناوەوە ناوەکانی نوسیبوو کادیرەکەش نەیزانی بوو ئەو نازناوەیان پێ ناخۆش دەبێ، ناوەکانی بەو شێوەیە خوێندبووەوە هەروەک: جەلال (شارێوی) و(مینە قرقێنە) و(ساڵح دوولوولە) و(ساڵح قوماش) و(سەعید تاپڕ) و(ئەحمەد مێرووڵە) و(عەلی تۆسکە) و(ڕەشەقۆڕ) ئەوانیش تووڕەبوون ڕاست ڕاویان نابوو کادیرەکە هەڵاتبوو، گوتیان با هەر حەمید سەعید عەسکەری بێتەوە نەیان زانیبوو ئەو نازناوانەی دابوو بە کادیرە تازەکە!.

## لێپرسراوی دێ

٢٠٧. لە گوندی گۆپتەپە دەم زێ (عەبدوڵڵا مام ڕەزا) لێپرسراوی دێ بوو، خەڵک وپێشمەرگەی دابەش دەکرد وئابوونەی لەجیاتی کادیرەکەی حزب وەردەگرت، جارێک ٢٥ دیناری ساڵی ١٩٦١ کۆکردبۆوە، ئەو پارە وئابوونەیە دیارنەمابوو، (حەسەن ئامینە بەکر) منداڵی گۆپتەپەی کۆکردبۆوە دژی گەندەڵی،

هاواریان دەکرد بەرامبەر لێپرسراوی دێی گۆپتەپە:

**موبارەکتان بێ ئەو مەسئولیـــاتە**
**بیست وپێنج دینار هەمووی قەپاتە**

## ناکرێ جارێک هەواڵێکی خۆش بهێنی

٢٠٨. مامۆستا عوسمان عومەر کۆیی ساڵی ١٩٨١ لای د.خدر مەلا مەعسووم بوو، کاروباری ئیدارەی بەڕیوەدەبرد، لە بارەگا بوو کردی بەهەرا گوایە هەندێ مێش لەسەر شەکرەکە بووە، مامۆستا عوسمان هاواری کردووە بەمامۆستا ئەمیر بەکر (عەوزە) ی گوتبوو (هەتیم دین گەواد مێشەکە شەکەر دەخوات) مام جەلال زانیبوویەوە هێنایە لای خۆی وەک عەدەد جیهاز، لە سکرتاریەتی مام جەلال هەندێ عەدەد جیهاز هەبوون وەک پەڕۆش موحەرەم وسەربەست ئەحمەد فەتاح و یەحیا تاڵەبانی وسەرکەوت محەمەد فەتاح و (ئازاد محەمەد قادر وخارە ئازادی عەدەد جیهاز) هەولێری بوو ئەمانە بروسکەیان دەهێنا ودەبرد بۆ مام جەلال، واتە هەر جارێکی بروسکەیەکی ناخۆش لە شەهیدبوون وگرتن وشەڕ وشکات وهەواڵی ناخۆش بوایە دەیان دایە مامۆستا عوسمان عومەر وئەویش بەخۆی ودەفتەری بروسکەوە بۆی دەبرد زۆرجار مام جەلال تووڕە دەبوو مامۆستا عوسمان پاک وبێ گوناح بوو. جارێک هەواڵێکی ناخۆشی بۆ دەبات مام جەلال دەڵێ کوڕم ناکرێ جارێکی هەواڵی خۆش بهێنی! تۆزێ عەقڵت هەبێ!

## هیچمان بەرنەدەکەوت!

٢٠٩. لەژیانی پێشمەرگایەتی وشاخ، گۆشت خواردن کەم بوو قادر شەوگێری وکەماله سووری سووره قەلا وخالید حاجی مەلا له تیپی ٩٣ی کۆیه بوون، پاره کۆ دەکەنەوه دوو مریشک دەکڕن دەیانەوێ لەماڵێک بۆیان لێ بنێ بیخۆن، له ساڵی ١٩٨٧ کەماله سوور دوو مریشکەکه دەباته ماڵێک له گوندی(بانەگوڵان) ی دەشتی کۆیه، ژنەکه دەڵێ وەی بەسەرچاو بۆتان لێ دەنێم ولەو مشت ومڕەبوون، ماڵەکه ٨-٩ منداڵی وردی لێ بوو پارچەڵە، پارچەڵە، سەلک وبنک کەمریشکەکان دەبینن هەر منداڵەی دەڵێ ئەوەی دەخۆم یەک دەڵێ ملەقۆتەکەی دەخۆم، منداڵێکی دی دەڵێ باڵەکەی دەخۆم یەکی دی دەڵێ ڕانەکەی دەخۆم هەر منداڵەی داوای پارچەیەکی له دایکی دەکات ئەوانیش لەمێژ بوو گۆشتیان نەخواردبوو، کەماله سوور قاچی هەردوو مریشک دەگرێ وهەڵدێ دەچێتەوه کن قادر شەوگێری وخالید چاوشین (خالید حاجی مەلا) دەڵێ چ بوو، ئەویش کوڕه هێندەیان منداڵ هەبوو هیچمان بەرنەدەکەوت بۆیه پەشیمان بوومەوه، لەوێ بیخۆین دەیبەمه جێگایەکی دیکه منداڵیان زۆر نەبێ!

## هێسترێک چەند دەرزی تێ دەبێ!!

٢١٠. کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان ڕێکخراوێکی مارکسی ولینینی بوو سەرەتا ناوی کۆمەڵەی مارکس ولینینی

بوو (م.ل)، پەیڕەوی مارکسی دەکرد، ئەندام ولایەنگرانی کتێب وبڵاوکراوەکانی مارکسیان دەخوێندەوە بەتایبەتی لەسەر پارتیزانی(ماو) لەخاڵێک دەڵێ گەر یەک دەرزی وداو لە جووتیار وەربگیرێت دەبێ بۆیان ببەیەوە، سەید کاکە لە بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان بوو، ئەوسا ساڵی ١٩٧٧ بزوتنەوە وکۆمەڵە وخەتی گشتی هەبوو لەناو (ی.ن.ک)، لەناو یەکێتی وململانێ وپێکەوە ژیانیان هەبوو، جا کادیرێکی کۆمەڵە هێسترێک لە گوندی (...) دەبا وماوەیەک بوو لەلای بوو نەی دەهێنایەوە، سەید کاکەش دەیگوت ئەو زەلامە ماوییە بۆ هێسترەکە ناداتەوە، توخوا هێسترێک چەند دەرزیی تێدەبێ!.

## ماکەری سیاسی

٢١١. خەدیجە ئەحمەد ئەلیاس پێیان دەگووت (خەجاوە) دایکی مامۆستا کازم مام حەسەن تەها پیرەباب، مامۆستا کازم کادیر بوو ڕابەری سیاسی تیپی ٩٩ی بیتوێن، هەر جارێکی دایکی بهاتبا پشتی ملی ماچ دەکرد ولەساڵی ١٩٨٦ بارەگای تیپی ٩٣ی کۆیە لە گوندی کانی کوردەی دەشتی کۆیە بوو، حەمە سووری کوێخا سدیقی کانی کوردە هات بەخێرهاتنی کرد وگوتیان ئەوە ئامر هەرێمی حزبی سۆشیالیستە، دایکی مامۆستا کازم پێی ناخۆش بوو گوتی ئیشەڵا هەونییە نا سۆشیالیست نییە، هەر لەوێ تەلەفزیۆن ئیشی دەکرد بەڕێکەوت کچ وکوڕێک لەشاشە

دەمیان لەناو دەمی یەکتر نابوو، وا لێویان لە ناو لێوی یەکتر بوو وەک یەکتر بخۆن!، دایکی مامۆستا کازم دەیگوت ئینشالڵا خوشک وبران چەند جار دووبارەی دەکردەوە، کە مامۆستا کازم بووە ڕابەری سیاسی تیپی ۹۹ی بتوێن، حسێنی برای مامۆستا کازمیان گرت ودایکی مامۆستا کازمیش لەکۆیە دەرپەڕی وهاتە گوندی کانی کوردە دەیانگوت بۆ واتان لێهاتووە دەیگوت لەوەتی کوڕەکەم بۆتە ماکەری سیاسی ئەوهامان لێ قەوما کوڕم چیشت بەماکەری سیاسی بوو! ئەوە کەی پلە وپۆستە وا تووشت کردین!.

## سەرلەقوڕنان

٢١٢. لە زستانی ساڵی ١٩٨٩ ئەنوەری حەلاو وبلەی قەمەرناز وسالاری سەلمە وئاسۆی خانەقا لە شاری سەقز لەگەڕەکی بەردبڕان ئارەق دادەنێن بە مەزە دەیڕازێنەوە بخۆنەوە، ئیمام خومەینی ڕەهبەری کۆماری ئێران، کۆچی دوایی کردبوو، هەر هاواریان دەکرد (ئەڵا وئەکبەر، خومەینی ڕەهبەر)، کۆمیتەی پاسداری دەچنە ئەو ماڵەی کە دەخۆنەوە، ڕاست ئەنوەری حەلاو سەری خۆی لە قوڕێ دەنێ ودەست دەکات بە گریان پاسدارەکان دەڵێن مەسەلە چییە دەڵێن ئەی چۆن ئیمام خومەینی کۆچی دوایی کردووە، شین دەگێڕین، خەڵاتیان دەکەن و وازیان لێ دەهێنن دەڵێن بەڕاستی بەوەفان.

## ئای ئەجەل!

٢١٣. خالید حاجی مـەلا و بـاواجـی حـاجی مـەلا چەند پێشمەرگەیەک لەتیپی ٩٣ی کۆیە ساڵی ١٩٨٦ پارە کۆدەکەنەوە دوو مریشک دەکڕن دەیبەنەماڵێکی لە گوندی (قەسرێ) ی دەشتی کۆیە، خاوەن ماڵ دەڵێ بەسەرچاو بەس چەند کەسن باواجی دەڵێ دوو کەسین، خـاوەن ماڵ خۆشحاڵ دەبێ، دوو مریشک بۆ دوو کەسان بەشی خانەخوێ دەکات کەچی بۆ نان خواردن کە دەچن ٨ کەس دەبن، خاوەن ماڵ بە باواجی دەڵێت تۆ نەتگوت دوو کەسین ئەوا (هەشت کەسن) باواجی دەڵێ چیان لێ بکەم خۆیان دابەش بوون وهاتوونەتە ئێرە خۆ دەریان ناکەین، لەسەر نانخواردن دەبینن مریشک وبرنج دانراوە، دوو زەلام بە بارە ترێیەوە ناسیاویان بوون دەچنە ئەو ماڵە خەنی دەبن کە برنج ومریشک دەبینن کابرای بارە ترێ دەڵێ ئای نسیب، خالید حاجی مەلاش ڕاست تفەنگ سوار دەکات بە سوعبەت دەڵێ ئای ئەجەل! کابرا دەشڵەژێ وتێک دەچێت دەڵێ کاکە نان وگۆشت وبەشتان ناخۆم مەمکوژن سەرەنجام نانیان لەگەڵ دەخوات!.

## شەرت بی گەر وابوو دوو تفم لەناو چاوی بکە!

٢١٤. ع.خ.م لەتیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بەخۆی و زنجیرە فیشەکی لەشان وقەد وملی ئالآندبوو سواری سیارەی قووت کراو بوو بوو، پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر سیارەی لاندگرۆزەریان بگرتبا بەتەور سەرەکەیان دەبڕیەوە، بەس جامی پێشەوەیان دەهێلایەوە، بەو سیارە سەقف براوەوە بە رەشاشەوە دەچێتە گوندی (شاخە پیسکە) سالی ١٩٨٤ مام مراد شاخ پیسکەیی دەبینی سەیرە ئەوە بۆتە پێشمەرگە دەلێت تەماشای بکەن دوو هەفتەی دیکە لە شێخەللا دەیبینم، پێشمەرگایەتی پێ ناکرێ بە ئاشکرا ئەو قسەیە دەکات (ع.خ.م) دەلێت گەر پێشمەرگایەتیم پێ نەکرا وتەسلیم بوومەوە، وەعدبێ دوو تف لەناو چەوانم بکە، وارێک دەکەون، هێندەی پێ ناچێ ع.خ.م تەسلیم دەبێتەوە، بەرێکەوت لەوێ دەیبینێتەوە ع.خ.م دەلێ مام مراد ڕاستە گرەوەکەت بردەوە، وەرە دوو تفم لەناوچاوی بکە، مام مرادیش نایەوێ تفی لێ بکات دەلێت قورگم وشکە بابچم بیبسی وکۆلایەک بخۆمەوە تەڕی بکەم ئەوجا دوو تفت لێ دەکەم!! خۆی لێ دەشارێتەوە وتفی لێ ناکات.

## بۆ بەتەمای بیخەیتەوە ناو دەمت؟

٢١٥. کادیرێکی یەکێتی هەبوو، چووە لایەکی دیکە وسەنگەری گواستەوە بۆ حزبێکی دیکە، چی قسەی ناشرین ونەشیاو بوو بە (ی.ن.ک)ی دەدا، بێ تام جنێوی دەدا وهێرشی دەکردە سەر یەکێتی، (سەگ وەڕین زیان لەهەور نادا) سەرەنجام داوای کرد بگەڕێتەوە ناو (ی.ن.ک) سەیر وجێی سەرسوڕمان بوو داوای لە مەلا تۆفیق کرد ڕای وەربگرن ئەویش بەلایەوە جێی گومان وپێی سەیر بوو، مەسەلەیەکی گێڕایەوە گوتی کابرایەک لە ناو تەوالێتی مزگەوت هەندە تڕی وکۆکی تا تاقمی ددانەکەی لێ کەوتە ناو ئاودەستحانەکەوە، کابرا هەر نەدەهاتەوە دەرەوە هەر خرتە خرتی بوو ئاودەستخانەی مزگەوتە وکاتی نوێژە، ناچار یەکێک دەرگاکەی کردەوە، دەبینێ کابرا دارێکی بەدەستەوەیە لەناو ئاو دەستخانەکە هەر دەگەڕێ لێی دەپرسی بۆ چەند دەقیقەیەکە نایە دەرێ چ قەوماوە؟ کابرا گوتی لەکاتی دەست بەئاوگەیاندن تاقمی ددانەکەم لێ کەوتە ناو ئاودەستخانەکە، دەگەڕێم بزانم نایبینمەوە، کابرا لێی پرسی بوو بۆ بەتەمایە تاقمە ددانەکەت ببینیەوە بیخەیەوە ناو دەمت! تازە لێی گەڕێ! مەلا تۆفیقیش دەیگوت تازە بەتەمایە بێتەوە ناو (ی.ن.ک) ئەوە تازە پیس بوە کەڵکی نەماوە بەکەڵک نایە! چی پێ نەکردووین.

## گەر حیزبایەتی نەبێ!

٢١٦. ساڵی ١٩٥٦ لە شاری کەرکوک مام جەلال بەڕێک وپێک ورەوانی وپڕزانیاری باسی کۆنگرەی حزبی کۆمەنیستی چین دەکا بۆ حلمی عەلی شەریف ومەلا ماتۆڕ وعومەر دەبابە وساڵح شێرە وخورشید شێرە هەمووی پێی سەرسام بوون بەلایانەوە زۆر جوان بوو قسە وباسەکەی مام جەلال بە ساڵح شێرە دەڵێ چۆن بوو بەدڵت بوو؟ ساڵح شێرەش دەڵێ گەر حیزبایەتی نەبێ سەد سەگ وسەگبابی وەک تۆ بۆم بڕێسێ هەتا سبەینێ تەقەی سەرم دێت وا دەزانم گوێزم بۆ دەژمێرێ!.

## خڕتان دە ...

٢١٧. فەرماندەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە داری کۆمەڵ لەپشدەر لەجێیەکی بەلاوە دەخۆنەوە، کابرایەک لە ماخۆبزنان دێت دەیاندۆزێتەوە، پێشمەرگەی دێرینە داوای پشتگرییان لێ دەکات ئەوانیش لەسەر کەیف و زەوق بوون، سفرە ڕازاوەتەوە بە کەو وسوێسکە وماسی وکەباب وگۆشتی برژاو هەمەچەشنە مەزە، هەموو جۆرە خورادنەوەیەک وێسکی، ئارەق، ڤۆدگا وشەراب وبیرە، بە کابرا ماخۆبزنانی دەڵێن کەی وەختی پشتگیرییە، تۆزەکی بخۆوە فڕکە نۆشکە ئەوجا کابراش لەو سفرە ڕازاوەیە یەک ودوو پێکی قورس بەیەک

بێن دەخواتەوە، لە کەو وسوێسکە وکەباب وگۆشتی برژاو لەو خواردنانە دەخوات وسەرخۆش دەبێت دەڵێت چما ئێوە ئەو چشتانە دەخۆن ودەخۆنەوە، وەڵاهی ئەمن ئەوانە بخۆمەوە خڕتان دەگێم!!.

## گەعدە

٢١٨. ئۆمەراغای بابکر ئاغای پشدەری فەرماندەی تیپی ٤١ی کوڕە کاژاو بوو، لە ڕیزەکانی (ی.ن.ک)ماڵی لە لۆتەرێ-کانی شینکە بوو، ساڵی ١٩٨٤ مولازم عومەر لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو لە (سێڕوان) بوو، لە دۆڵی مەرگە، ئۆمەراغا عەرەبی نەدەزانی فرێ پێیەوە نەبوو. مولازم عومەر نامەیەکی بۆ دەنووسێ دەڵێ تەشریف بفەرموو ئێوارە لە (ئاوەژێ) گەعدەمان هەیە، ئۆمەراغا وا دەزانێ گەعدە کۆبونەوەی سیاسییە بە محەمەدی ئایشە قیلواندا کە پێشمەرگە وشوفێری بوو، نامەیەک بۆ مولازم عومەر دەنێرێت دەڵێت من لە سیاسەت چ نازانم چ بڕیارێک دەدەن وبیدەن، دوایی پێیان گوتبوو (گەعدە) واتە دانیشتن وخواردنەوە، دەیگوت وەڵاهی بمزانیبوایە خواردنەوە ودەعوەتە ودەچووم حەیف لەکیسم چوو چوزانم گەعدە چییە!!.

## چی لێ تێ نەگەیشتم

٢١٩. حاجی میناغای گربداغ خوشکەزای ئۆمەراغا بابکرئاغای پشدەر بوو، نێوانیان نەبوو، خێرخوازێ لە گوندی گردە سپیان لە ئاغایانی میراودەلی (سلیم محمد ئاغای خدر ئاغا) سلیم چاوشین دەیەوێ ئاشتیان بکاتەوە، داوەتێک سازدەکا، هەروەک پێکەوە دەبن خاڵ وخوشکەزا، ئۆمەراغا دەڵێ بابزانم حاجی مینا ئاغا چی دەوێ کێشەی چییە چ دەڵێ؟ حاجی میناغاش عەرەبی دەزانی وخوێندەوار بوو خووی وابوو کە قسەی دەکرد وشەی عەرەبی زۆر بەکاردەهێنا دەڵێت (بەرەحابەتی سەدر دێمە پێش)، بەڵام خاڵم حوبی زەهوری هەیە، تەمەلووقی بۆ ناکەم خاڵم هەروایە! ئۆمەراغا یەک وشەی عەرەبی نازانێ دەڵێ: چی تێ نەگەیشتم باسی چی کرد ئەو قسانە یەعنی چی؟ وئاخر تێک نەگەین چۆن ئاشت ببینەوە!!.

## ئارام

٢٢٠. لەسەرەتای شۆڕشی نوێی گەلەکەمان لە ساڵانی ١٩٧٦-١٩٧٩ بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان زۆر بەهێز بوو لەناو (ی.ن.ک) هاوڕێیانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان دەچنە کن شاسوار جەلال (ئارام) دەڵێن ئەمە شۆڕشمان وا هەڵنەگیرساند ئەوان ئەوها بەهێزبن! هاوڕێ ئارام هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە بەدەنگی بەرز دەڵێ عەلی عەسکەری

د.خالید -عومەر دەبابە، زۆر لەسەرخۆ وبەهێمنی وبەنەرمی بەیەک پەنجە دەڵێ (ئارام) واتە ئەوان دیار وناودار وبەهێزن، منیش تەنیام لەچاو ئەوان!!

## نەیسەلماند

٢٢١. ساڵی ١٩٧٩ بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان، پێش، مام جەلال لەگەڵ مەلا ناسیح هەر پێکەوە بوون، تەنانەت لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلول لە چەمی ڕەزان وارێکەوتبوون، کێ کوڕێکی ببێ ناوی بنێن (بافل) چونکە تاڤگەیەکی بچووک بوو لە چەمی ڕەزان، پەیوەندییان پتەو بوو، ساڵی ١٩٧٩ پێش ئەوەی بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان جیابنەوە، بەحوکمی ئەو دۆستایەتییەی لەناویان دابوو، دەعوەتی کردبوو، قەلی بۆ سەر بڕیبوو، شەترەنجی لەگەڵ کردبوو، دەیویست جیانەبێتەوە، پاش گفتوگۆیەکی دوورو درێژ مەلا ناسیح نەیسەلماندبوو، جا کۆتاییان بە گفتوگۆ ودانیشتنەکە هێنابوو، چاوەڕێیان دەکرد بزانن ئەنجامەکە چییە! گوتیان ها مام جەلال چی بوو لەگەڵ مەلا ناسیح! مام جەلال گوتی ئەو سەگبابە دەعوەتم کردو قەلم بۆ سەربڕی ودوو شەترەنجم بۆ دۆڕاند هەر نەی سەلماند! جیادەبێتەوە هەر دەڕوا!.

## عەبدولرەحمانە شێتەی عاقڵ

٢٢٢. عەبدلرەحمانە شێتە پیاوێکی ژیر وعاقڵ بوو لە خۆشەویستی پێیان دەگوت (شێتە) کەسایەتی بوو جارێک لەگەڵ شێخ جەنگی تاڵەبانی نێوانیان نەبوو، لە دینگەکانی ناوبازاڕی کۆیە تووشی یەک دەبن وڕووبەڕووی یەک دەبنەوە کە پێشتر زۆر برادەر بوون، وڕێک وپێک وزۆر کات پێکەوە بوون، شێخ جەنگی خۆی لێ لادەدا وبۆئەوەی تووشی نەبێ! شێتە دەڵێ: مەڕۆ خۆت لامەدە کۆیە پیاوێکی تێدا نییە ئاشتمان بکاتەوە با بۆخۆمان چاک بینەوە وئیتر ئاشت دەبنەوە، عەبدولرەحمانە شێتە ئەندامی ئەنجومەنی کۆیە بوو دەچنە لای مام جەلال لە قەڵاچوالان باسی کێشە وگیروگرفتەکانی کۆیە دەکەن، مام جەلال دەڵێ کۆیە فیتنەی لێ نابڕێ، عەبدولرەحمانە شێتەش دەڵێ خۆت یەک لەو فیتنانەی بە فیتنەی حەوت دەوڵەتان بەناوبانگی دەست دەکەن بە پێکەنین!

## تا دەسەڵاتیان نەگرتۆتە دەست پەتکیان کەین

٢٢٣. لە گوندی کەلکینی (ئـازەرا)، گوندێکی گـەورەی خەیلانایەتییە، فەرحاناغا سـەرۆکی خێڵی خەیلانییان بوو، پیاوێکی خانەدان بوو، لە ساڵی ١٩٨٨ دوو کادیری چەپڕەوی زەحمەتکێشان مێوانی دەبـن، گفتۆگۆیەکی توند سـەبارەت بە قۆناغی سەرکەوتن دێتە ئاراوە بە فەرحاناغا دەڵێن: ئێمە

چۆن بەزەبری شۆڕشگێڕانە هەموو شتێکی کۆن لەناو دەبەین، بەهەمان شێوە سۆشیالیزم بەهێزی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا دادەمەزرێنین! سەرمایەداری ودەرەبەگایەتی ودابونەریتی خێڵەکی لەڕەگ وڕیشەوە هەڵدەکێشین، فەرحاناغا لەو چەمکانە حاڵی نابێ لێیان دەپرسێ باشە (چ لۆمە ئەکەن) واتە (چی بۆ ئێمە دەکەن) ئەوانیش بەتوندی ڕای خۆیان دەڵێن هەموو ئەوانەی وەک تۆن پەتکیان لەمل دەکەین، فەرحاناغاش تووڕە دەبێ بانگی جوانەی کوڕی دەکاتن دەڵێ پەتکەکم بۆ بهێنە تا ئەوان دەسەڵاتیان نەگرتۆتە دەست تا ئێمەیان پەتک نەکردووە با پەتکیان بکەین.

## حەمە حزب

٢٢٤. محمد سەعید فەتاح کەرەم وەیس ناسراو بە (حەمە حزب) خەڵکی پونگڵەی شارەزوور بوو، کە م.س یەکێتی یاداشتێک دەداتە مام جەلال وەک نارەزایی، حەمە حزب دەچێتە حەجێ لەسەر مەرقەدی پێغەمبەر زۆر دەگری، دەپاڕێتەوە و دووعا دەکات، مەرقەد ڕادەشەقێنێ و دەڵێت: پێغەمبەر دەبم بە قوربانت پیلانیان لە مام جەلال گێڕاوە، دەخیلت بم بە هانای وەرە! دامنابوو ببێ بە سەرۆکی هەموو دەوڵەتی عەرەبیش کەچی برادەران لێی ناڕازین، وەش وەش بە گریانەوە، بە واوەیلاوە، لەسەر مەرقەدی پێغەمبەر بۆ مام جەلال دەپاڕێتەوە!!!

## هەق

٢٢٥. قادر عەزیز سکرتێری حزبی ئایندەی کوردستان بوو، عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی بوو لە ساڵی ٢٠١٢ کۆبوونەوە دەکەن قادر عەزیز دەڵێ: مامۆستا عەلی باپیر دەزانی ئەمن چەند هەق ورەقم، مامۆستا عەلی باپیریش دەڵێ: هەقمان لێ بینیوی بەس ڕەقمان لێ نەدیوی!!

## گوو ناخۆنەوە

٢٢٦. چەند پێشمەرگەیەک لە ماڵێک لەو گەرمیانە دابەش دەبن، پێشمەرگەیەک چای لەبەردەم دەبێت، خاوەن ماڵەکە دێتەوە و و دەبینێ ئەوانی دیکە چایان لەبەردەم نییە، بۆیە بانگ لە ژنەکە دەکات و دەڵێت: ئافرەت چایان بۆ تێکە، ژنەکە دەڵێت ناخۆنەوە و کابراش زۆر بە خێرایی دەڵێت: گوو ناخۆنەوە، بۆیان تێکە، گوو چۆن ناخۆنەوە!!

## ڕووخاو

٢٢٧. پێشمەرگە بە گشتی حەزی لە هەورازان نەدەکرد، چوونە سەرشاخ و هەڵگەڕان بە هەوراز ماندووبوونی دەوێت، پێشمەرگەیەکی حزبی شیوعی تازە هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی لە بن هەورازێک دەبن، پێشمەرگەیەک بە پێشمەرگە تازە هاتووەکە دەڵێت: بۆ ئەوەی نەڕووخێیت و بە ئاسانی بەسەر هەوراز و

لووتکەی شاخەکە بکەوی تەماشای بەرزاییەکە مەکە، پێشمەرگە تازە هاتووەکە گوتبووی بۆ زووتر واتان نەگوت، من پێشتر تەماشای سەر شاخەکەم دەکرد، دوو پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە بەتالیۆنی ١٥ی قەرەداغ ڕووخابوون و ورەیان نەمابوو، لێپرسراوەکەیان (حەمە ڕەشید قەرەداغی) لە بن هەورازەکە دەیەوێت ورەیان بەرز بکاتەوە و قسەیان بۆ دەکات هەرچەند دەکا و دەکولا پێشمەرگە ڕووخاوەکان ورەیان بەرز نابێتەوە، پێشمەرگە ڕووخاوەکان دەڵێن قسەی چیمان بۆ دەکەن، خەبات و پێشمەرگایەتیمان بۆ ناکرێ، دەڵێن تانجی بە زۆر ڕاوناکا، کەری تۆپیو جۆ ناخوا! ئیتر لە بن هەورازەکە دەچەقن و وا دەڕووخێن تەسلیم دەبنەوە!.

## با ئەو مەنجەڵە ئاوە گەرمە خەسار نەبێ!

٢٢٨. شەهیدان ئازادی حەمە گەمحان و دڵزار و ڕزگار لە ساڵی ١٩٨٧ شەهید کران، ڕێو ڕەسمی شوشتن و ناشتنیان لە گوندی شیوەشانی دەشتی کۆیە بۆ کرا، چونکە سێ شەهید بوون ئاوێکی زۆریان گەرم کرد بوو، سەرەنجام شوشتیانن بەڵام مەنجەڵە ئاوێکی گەرم زیادبوو، نەوزادی مەجید سووسکە پ.م بوو لە تیپی ٩٣ی کۆیە زۆر چڵکن بوو، جل و بەرگ و جەمەدانی پڕ قرێژ و پەڵەی چڵکنی بوو، سامانی فائق ئاغا پ.م بوو لە تیپی ٩٣ی کۆیە، لەو وەزعەدا بە کابرای مەیتشۆر دەڵێت: با ئەو مەنجەڵە ئاوە گەرمە خەسار نەبێ، نەوزاد زۆر چڵکنە زەحمەت نەبێت ئاوێکی پێدا بکە و بیشۆ!!. پاش ڕاپەڕین نەوزاد شەهید کرا.

## فیتەری بەکراسی ژنان

٢٢٩. لە ساڵی ١٩٨٥ تەها پ.م بوو لە تیپی ٣١ی سلێمانی دەستی فیتەری هەبوو، کەرتی چواری تیپی ٣١ی سلێمانی ئۆتۆمبێلێکیان لە گوندی (مالوومە) لێ تێکچوو، ئۆتۆمبێل پەکی کەوت، تەهاش دەیویست چاکی بکاتەوە، بەڵام کەچە و کۆنە بەرگێکی پێویست بوو زۆر گەڕا لە ناو گوند بۆ بەرگێکی کۆن بۆ ئەوەی کە بچێتە ژێر ئۆتۆمبێلەکە، سەرئەنجام کچێکی گەنج لەوێ بوو گوتی کراسێکی کۆنم هەیە و بە کەڵکی لەبەرکردن نایەت و دایە دەست تەها، تەهاش جلکە ژنانەکەی لەبەرکرد و چووە ژێر ئۆتۆمبێلەکە لە پڕ دایکی کچەکە لە (کانی) هاتەوە، کراسی کچەکەی بینی وایزانی کچەکەیەتی، بە توورەییەوە دەستی کرد بە تف لێکردن و جنێوپێدان، تەهاش لە ژێر ئۆتۆمبێلەکە و بە کراسی ژنانە و چەور و گریزاوی هاتە دەرێ، دایکی کچەکە تەریق بۆوە و هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین!!

## ئەو پیاوە نین

٢٣٠. تیپی ١٥ی شـارەزوور پاش سێ مانگ لە ئـەرک و شەڕ گەڕانەوە، کە دەگەڕێنەوە لە گوندی (کەندەکەوە) لە نزیک تاسڵووجە بەسەر کەمیندا دەکـەون و تەقەی زۆریـان لەسـەر دەکرێت، وەرزیش زستان بوو لە قوڕ دەچەقن و پێڵاویان لێ بەجێ دەمێنێ! زۆر قوڕاوی و ماندوو دەبن ودەگەنە گوندی (تەپەڕەش) شەهید خەلیل سـەراوی و ئەکبەرسان ئەحمەد لە

دەرگای ماڵێک دەدەن، ژنی ماڵەکە دەرگایان لێناکاتەوە! ژنەکە دەڵێت پیاومان لە ماڵ نییە بەو شەوە درەنگە، دەرگاتان لێناکەمەوە، چونکە پیاوەکەم لەوێ نییە، ئەکبەر سان ئەحمەد دەڵێت خوشکم دەرگامان لێبکەوە وەرە بمانبینە بزانە پیاوەتیمان تێداماوە هەندە قوڕاوین و ماندووین و بەسەر کەمیندا کەوتووین، حاڵمان شڕە ئەو پیاوە نین وەک تۆ واین!!.

## تا نەڵێن شۆڕشگێڕانێک تەسلیم بۆتەوە

٢٣١. (ش.ع.ک) ئەندامی یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستان بوو زۆر ململانێ دەکرا لەسەر ئەوەی شۆڕشگێڕانە لەلایەن کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە (ئەوسا یەکێتی نیشتمانی کوردستان) پێک هاتبوو لە (کۆمەڵە وشۆڕشگێڕان) ئەوی ڕای باش بوایە لەنێوان هەردووکیان دەیانگوت (شۆرمەڵە)یە، (ش.ع.ک) پ.م بوو لە تیپی ١١ی هەورامان، بێزار بوو بوو لە ئەو ململانێ و ئازار و دەردی ڕێکخستن ساڵی ١٩٨٧، لە پڕ دەبێتە کۆمەڵە، هەڤاڵان و هاوڕێیان زۆر پێیان سەیر بوو (ش.ع.ک) ببێتە کۆمەڵە چونکە ئەو شۆڕشگێڕانیکی تۆخ بوو، ماوەیەک مایەوە، دوایی ڕێک تەسلیم بە ڕژێم دەبێتەوە ،سەرەنجام دەیبینن دەڵێن مادام تەسلیم دەبوویەوە، بۆ لە ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان شۆڕشگێڕان نەبووی، بوویە کۆمەڵە!! (ش.ع.ک) دەڵێت: بە بیروباوەڕ شۆڕشگێڕان بووم، لەبەر خۆشەویستی

و ڕێز بۆ شۆڕشگێڕان بوومە کۆمەڵە تا نەڵێن شۆڕشگێڕانێک تەسلیم بۆتەوە، دەڵێن پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە تەسلیم بۆتەوە، بۆیە نەمدەویست بە شۆڕشگێڕان تەسلیم ببمەوە!!.

## تووڕەیی بەخێر

٢٣٢. ملازم عومەر ئەندامی م.س (ی.ن.ک) بوو لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو، مامە قالە پ.م بوو لە لای، جارێک ملازم عومەر لێی توڕە دەبێت، ڕێک زللەیەکی بە مامە قالەدا دەکێشێ، دوایی ئاشتی دەکاتەوە، دوو هەزار تمەنی ئێرانی دەداتێ، مامە قالەش دەڵێت شەڕ لەگەڵ تۆدا خێری تێدایە!!.

## الفاتحه

٢٣٣. ساڵی ١٩٨٩ هیوا پ،م بوو لە دۆڵەکۆکە، بۆ ئازووقە هێنان هێستر دەبات، لە نێوان (گوێزێ و دۆڵەکۆکە) جێیەک هەبوو کە ناونرابوو (دیواری مەرگ) لەوێدا هێستر هەڵدێراو تۆپی، هیواش کورتانەکە هەڵدەگرێتەوە، بە شانی خۆیدا دەدا، مل لە بارەگای دۆڵەکۆکە دەنێت و دەڵێت (الفاتحە) پێشمەرگەکان سەریان سووڕدەمێنێ فاتیحەی چی! هیوا دەڵێت: هێسترەکە هەڵدێراو و تەواو!!.

## مادام ناوی (چاوەش) یکی لەخۆناوە هەر دەیکوژم

٢٣٤. فاروق کەمال لە بەگی (وەری)ی خۆشناوەتی بوو ناسراو بوو بە زیرەک کەمال، لە ریکخستن پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعی هەبوو، ساڵی ١٩٨٤ دەبیتە پیشمەرگە، دار و دەستەی بەعس بانگی کەمال بەگی وەری دەکەن، دەڵین کورەکەت لە کوییە! کەمال بەگی وەری چ زانیاری نابێ کەوا کوریکی بۆتە پیشمەرگە، (زۆری دەهینن و دەبەن) ئەوان دەزانن کورەکەی پیشمەرگەی حزبی شیوعیە، بۆ کەمال بەگی وەری قورس بووە چونکە خۆی لە بەگزادەکانی خۆشناوەتییە، لەگەڵ بیرۆکەی حزبی شیوعی یەکناگریتەوە، کە دەگەریتەوە بۆ گوندی وەری، نامەی کورەکەی بە دەست دەگات، ئاماژە بە ئەوە دەکات کە دیار نەبووە، بۆتە پیشمەرگەی حزبی شیوعی و لە کۆتایی نامەکەی نوسیبووی کوری خۆت (زیرەک)!! کەمال بەگی وەری هیندەی دی توورە دەبیت، دەڵیت: گەر لەسەر بوونی بە شیوعیەت نەیکوژم بەڵام هەردەبێ لەسەر ناوی (زیرەک) بیکوژم، چونکە بەگزادەیە و ناوی چاوەشیکی لە خۆی ناوە!!

## ئیشی چیت هەیە

٢٣٥. پاش ئەنفالەکان ساڵی ١٩٨٩ بارزانی قالە خەڵوز بەپەلە و مەشغوڵی و مشەوەشی دەیەوێ بچیتە فرۆشگای نۆکان، مام

سالحە ڕەشی مالوومە کە پاسەوان و ئێشکگری مام جەلال بوو، لەو کاتە مام جەلال لەبەر هەیوانی مالەکە بوو ئاسایی وەستابوو، مام سالح ڕەشیش ئێشکگری بوو، بە بارزانی قالەی خەلوز دەلێت بۆ وا بە پەلە و خێرا و مشەوەشی، بارزان دەلێت: وەختم نییە زۆرم ئیش هەیە!! واز بهێنە، مام سالح ڕەشی مالوومە سەیری پێدێت، دەلێت ئیشی چیت هەیە، تۆ ....چی... قابیلە لە مام جەلال گەورەتر بی ئەو ڕابەر و سەرۆکی کوردانە، ئەوە دەبینی بێ ئیشە هیچ ئیشێکی نییە!!.

## خۆ تاقییان ناکەمەوە

٢٣٦. خێزانی (م.ع) لە سەقز کۆچی دوایی کردبوو سالی ١٩٨٩ دلێری سەید مەجید سێ مەلای هێنابوو بۆ پرسە و قورئان خوێندن، یەک لە یەک دەنگ ناخۆشتر! سەرەنجام (م.ع) دەلێت: کاک دلێر ئەو مەلا دەنگ ناخۆشانەت لە کوێ هێناوە، ئەمانە کەی (مەلا)ن کەی قورئان خوێنی دەنگ خۆشن! نەدەبوو مەلایەک بهێنی دەنگی خۆش بێ! دلێری سەید مەجیدیش دەلێت: چ بکەم خۆ تاقییان ناکەمەوە، سورەتێک قورئانیان پێ ناخوێنم، چوزانم دەنگیان خۆشە یان ناخۆشە!!.

## دارەرا هەستم

٢٣٧. ئەنوەری حەلاو بە بێ چەک لە بازگەی ئێران ئەبێت، ڕایان دەگرن! کابرای پاسدار لە ئەنوەری حەلاو دەپرسێت (موسەلەح هەستی) واتە چەکداری ئەنوەری حەلاویش چەکی پێ نابێ دارێکی پێیە لەسەرخۆ دەڵێ نەوەڵا ( دارەرا هەستم) جەناب!

## حیکمەت وحکومەت

٢٣٨. لیوا خەلیل دۆسکی بادینی بوو، لە قسەکردندا (ی) بەکاردەهێنا بۆ نموونە بە خەسووی دەگووت خەسی، بە موصل دەیگووت میسل بە حکومەتی دەوت حیکمەت، لە شەڕەکانی سەرکردایەتی تووشی بەرزانی قالەی خەڵوز دەبێت، لیوا خەلیل دەپرسێت: بارزان حیکمەت گەیشتۆتە کوێ ؟! بارزان دەڵێت حیکمەت لە سەرگەڵووە لە (بارەگای فەرەیدوون عەبدولقادر) لیوا خەلیل دەحەپەسێ چۆن حیکمەت هاتۆتە ئەوێ، کەوابێ سەرکردایەتی گیراوە، تومەز مەبەستی بارزان حیکمەتی پ.م بوو لە بارەگای فەرەیدوون عەبدولقادر ئەویش مەبەستی هێزی حکومەت بوو دەیگوت حیکمەت!.

## هۆش سفر شەش

٢٣٩. لە داستانی ڕزگاری مام جەمال ئاغا جیهازێکی هۆکی تۆکی پێدەبێت قسە لەگەڵ وەستا عەبدول دەکات، جیهازەکەی وەستا عەبدول کۆدە نهێنیەکەی سفر شەش بوو، لەو کاتە مام جەمال ئاغا لەسەر ئەسپ دەبێت، وەستا عەبدول پەیوەندی پێوە دەکات، ئەسپەکە هەر دەجوڵێ و ناوەستێ مام جەمال لەسەر جیهازەکە دەڵێت ( هۆش سفر شەش )!! وەستا عەبدول دڵگران دەبێت وادەزانێ لەگەڵ ئەویەتی!!.

## بابخەوین

٢٤٠. ساڵی ١٩٨٦ تیپی ٧٨ی کاروخ لە خۆشناوەتی بوون ،حسێن مامۆ وەرتەیی لە ماڵێک دەبن دوو کچی پێشمەرگەی لە تەنیشت بووە! شەو یەکێک لە پێشمەرگەکان دەڵێت با بخەوین، حسێن مامۆ وەرتەیی جێی باش بووە، دوو نازداری لە تەنیشت بووە، گوایە وتوویەتی با هەر کەس لە شوێنی خۆمان بخەوین، وەڵا بابە خراپ نییە!.

## تۆ خاوەنی ئەسڵی نیت

٢٤١. عادل بنگردی پ.م بوو لە ڕیزەکانی (ی.ن.ک) شەوێک لە کەپکی شیلانە زۆر سەرمای دەبێت و چونکە زستان بوو، بەفر کەپکی شیلانە و شاخی داپۆشیبوو، پاش ئەرک و لە سەرمان

ڕوو لە گوندی (گەرۆتە) دەکەن لە ناو خوێندنگایەکە دەبن، مقەبا ڕادەخا و کۆڵەپشت و تاقمەکەی دەکاتە سەرین بەلام ساردبوو شەو درەنگ بوو لەسەرمان، خەوی لێ ناکەوێ، ناچار ڕوو لە ماڵێک دەکات، سەگێکی پێ دەوەڕێ و ڕاوی دەنێ، ڕوو لە کاولە خانووەک دەکات، کەرێکی لێدەبێت و کورتانێکی باشی بە پشتەوە دەبێت بۆیە کورتانەکە لێدەکاتەوە و دەیباتەوە بۆ ناو مەکتەبەکە و لە بنی کورتانەکە دەخەوێ! بۆ بەیانی دەیەوێت کورتانەکە بباتەوە، خاوەن کەرەکە تووشی دەبێت و دەڵێت کورتانەکەم بدەوە من خاوەنیم، عادل بنگردی بە خاوەن کەرەکە دەڵێت، ڕاستە تۆ خاوەنی، بەڵام خاوەنە ئەسڵییەکە کەرەکەیە، تۆ خاوەنی ئەسڵی نیت، سوپاستان ئەکەم!!

## شوێن پێی قەل

٢٤٢. عوسمان مەلا داود پ.م بوو لە (سەرکردایەتی) خرتە قەلێکی باشی دەبێ، هەر قەڵەوی دەکا و نایخوا و سەرینابڕێ، بارزانی قالە خەڵوز و شەماڵی بەهجەت کابان دوو پێشمەرگەی دیاری ناو (ی.ن.ک) بوون، پێ دەزانن قەلەکە دەگرن و سەری دەبڕن، وەختەکەش زستان بووە و بەفر هەمووی داپۆشیبوو و، قاچەکانی قەلەکە بە دوو دارەوە دەبەستن و جێی پێی هەڵدەگرن و وای لێ ئەکەن و دەیبەنە بەردەم ماڵی وەستا کەمال و وەستا کەمالیش ئاگای لە هیچ نییە، عوسمان مەلا داود دێتەوە لە قەلەکە

دەگەڕێت بە شوێن پێ وا دەبینێ لە ماڵی وەستا کەماله ئیتر وەستا کەمال چەند پاکانە دەکا و دەڵێ قەلم نەدیوە، پوختە لەسەر قەلەکە و جێپییەکەی بەشەڕ دێن، بارزان و شەماڵ ئاگایان لێیە، قەل لەلای ئەوانە و قولپ قولپ دەکوڵێ، دەڵێن قەلەکە کولاوە با بیخۆین، ئەوانەش با مەشغوڵی شەڕ وجنێوو لێدان بن!!.

## جێبی هەرزان

٢٤٣. ساڵی ١٩٨٥ حەسەن عەوێنە و جەلال شەکری پ.م بوون لە تیپی ٨٥ی بەڕانەتی لەناو هەولێر جێبێکی مۆدێل ١٩٨٤ ڕەقەم شین دەهێنن و دەگەڕێنەوە بۆ گوندی (دەربەندی سەیدان) شەهید عومەر عەوێنە فەرماندەی کەرت بوو، خەڵکی گوندەکە و چەند مامۆستایەک پێی دەڵێن بەڕاستی جێبێکی چاک و پاکە! بۆ ئێمە باشە بۆ هاتووچۆ و شەهید عومەر عەوێنە دەڵێ زۆر هەرزانمان کڕیوە، مامۆستاکان وتیان بۆ نایدەنەوە بە ئێمە، شەهید عومەر عەوێنە دەڵێت بۆیە وا هەرزانمان کڕیووە، ئەم جێبە ١٠ ساڵ زەڕیبە قەرزارە و بەکەڵکی ئێوە نایەت خۆی جێبەکە مۆدیل ٨٤ بوو ساڵەکەش ٨٥ بوو ( هەموو عومری جێبەکە یەک ساڵ بوو) مامۆستاکانیش دەڵێن ئا ...لۆیە وا هەرزانتان کڕیوە، بە کەڵکی ئێمە نایە مادام ئەوەندە ساڵە زەڕیبە قەرزار بێ بۆ خۆتان باشە، نەیان دەزانی فڕاندوویانە لە حکومەت پارەیان پێنەداوە!!.

## تاچەندت خوێندووە

٢٤٤. پاش ئەنفالەکان ساڵی ١٩٨٨ پۆلێک پێشمەرگە لە گەرمیان لە خۆشاردنەوە و پارتیزانی بوون، شێخ تەها لێپرسراوی کۆمەڵایەتی لە تیپی ٥٩ی حەمرین بوو، یەکێک لەو پێشمەرگانەی مەفرەزەکە (ئاری مامۆستا ڕەئوف بێگەرد) بوو ڕۆژێکیان بۆ جێگۆڕکێ و وتیان بەپەلە با (هێستر)ەکە بار بکەین، بە ئاری دەڵێت برۆ (ڕێشمە و سەرکەڵلە و قەراسەکە) بهێنە (ئاری) دەحەپەسێ ونەیدەزانی ئەو کەل و پەلانە چین! چەند دەکات سەری لێ دەرناکات، مام تەها توورە دەبێت و دەڵێت: ئەو شتانە نازانی تا چەندت خوێندووە، ئاریش دەڵێت: تا شەشی ئامادەیی، مام تەها دەڵێت: عەمری ئەو مامۆستایە نەمێنێت کە دەرسی پێ وتووی، چۆن نازانی ڕێشمە وسەرکەڵلە وقەراسە چییە!!.

## کفتە

٢٤٥. لە بەهاری ساڵی ١٩٨٣ دەستەیەک لە پێشمەرگەکانی حەسەن کوێستانی، بۆ ئەرکی پێشمەرگایەتییان لە دەشتێ وەزنێ بوون لەگەڵ پێشمەرگەکانی حزبی دیموکراتی ئێران، ئەو سەردەمە لە عێراق و ئێران بۆردومان دەکەن بۆ خۆشی کفتەیان لە ئێرانەوە بۆ هاتبوو، کفتەی تەورێز ناوبانگی هەیە، لەو کاتەی بۆردمان بووە، یەکێک لە پێشمەرگەکانی تیپی ٧٨ی کاروخ لە

کاتی بۆردومان کفتەیەک لە پ.م محمد عومەر دەدات کە لە هەمان تیپ بووە، کفتەکە لە تیلەقەی پشتی دەدات، پ.م محمد عومەر دەست لە پشتی دەدات، دەزانێت کە تەڕ و پلیقاوەیە، ڕێک هاوار دەکات و دەڵێت بچەمێنەوە، بریندار بووم و کوژرام، برینەکەم گەرمە بۆیە ئازارم نییە!!.

## بەژن بمنووسە

٢٤٦. ساڵی ١٩٨٤ لە بارەگای مەڵبەندی سێ لە بۆتێ لیستی ناوی پێشمەرگەکان ئامادە دەکەن، پێشمەرگەیەک بە ناوی جەلال بەپەلە هات، لەو کاتەی لیستەکە وا دادەڕێژرا سەڵت و خێزاندار دەنووسرا، بۆیە پ.م جەلال لە جیاتی بڵێ خێزاندارم، گوتی کاکە من بە ژن بنووسە!!!.

## شێتم دەکەن

٢٤٧. فەرەیدون عەبدولقادر بانگی مارف سیتەکی دەکات کەوا کارێکی هەیە سێ پێشمەرگەی ڕێک و پێک ئامادە بکات بۆ ئەنجام دانی کارێک، فەرەیدون عەبدولقادر دەڵێت: پێشمەرگەیەکیان چاوساغ بێت، مارف سیتەکی چاوێکی نابینا بوو دەڵێ، خۆم، دوای دەڵێت پێشمەرگەیەکیان قاچی ڕاست و ساغ بێت دەڵێ، دلاوەرە شەل، کە قاچی تەواو نەبوو، سێیەمیان ئەڵێت یەکیان عاقڵ بێت، مارف سیتەکی عەلی بۆڵەبۆڵ دیاری دەکات، فەرەیدوون عەبدولقادر توورە دەبێت و دەڵێت: تەماشای بەخوای شێتم دەکەن!!.

## شەهید بوویم

٢٤٨. ساڵی ١٩٨٧ تیپی ٧٨ی کارۆخ لە دەشتی کۆیە بوون، پۆلێک فڕۆکەی پیلاتۆز بۆردومانی کرد، تەنانەت هێشوویەک بۆمبا کەوتە سەر سفرەی پێشمەرگەکان، هەموو پێشمەرگەکان لە ژوور دەرپەڕین بۆ دەرێ تەنها پ.م (محمد خدر) نەهاتە دەرێ، حسێن مامۆ وەرتەیی لیی دەپرسێ بریندار بووی بۆیە نایە دەرەوە، پ.م محمد خدر دەڵێت: نـەوەڵا بریندار نەبویم، شەهید بوویم!!!

## بۆمان لێ دە تاکو بنی

٢٤٩. ساڵی ١٩٨٦ حەسەن کوێستانی لەگەڵ دەستەکەی لە دۆڵی جافایەتی دەبن، وەرزەکە پایزە وشەویش دەبێ، شاخەکەش تاریک دەبێ، شوانێک لەسەر شاخ لایتیان بۆ لێدەدات بۆ ئەوەی ڕێگاکەیان لێ ون نەبێ ،پێشمەرگەیەک بە ناوی عەبدوڵڵا ڕێیەکەی لێ تێک دەچێ بۆیە بە شوانەکە دەڵێت: کاکی شوان لەسەر ڕا بۆمان لێبدە تاکو بنی، مەبەستی لایت داگیرسان بووە، حەسەن کوێستانی بەو ماندووبوون و سەغڵەتە دەڵێت: کاکی شوان بۆ منی لێمەدە!!!.

## بەجەماعەت خۆشە

٢٥٠. پێشمەرگەکانی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، بە ڕێکەوت ڕۆژی هەینی ساڵی ١٩٨٧لـە گوندی (جل بەسەر)ی سەیدان دەبن هەندێک لەو پێشمەرگانە دەچنە نوێژی هەینی، بۆ ئەوەی خەڵکەکە زیاتر لوتفی هەبێت، خزمەتیان پتر بکەن، یەکێک لە پێشمەرگەکان لە جومعە و جەماعەتەکە دەڵێت: خوایە گوومان خوارد، چەندین جار دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: خوایە تۆبە، خوایە گوومان خوارد، یەک لە سەیدەکانی گوندی جل بەسەر لە تەنیشت ئەو پێشمەرگەیە دەبێ و پێی دەڵێت: ئەرێ کاکە بۆ ناڵێی خوایە گووم خوارد ئەو خەڵکە هەموو بۆ گوو خواردوو دەکەیت، پێشمەرگەکەش دەڵێت: ئاخر هەموو شتێک بە جەماعەت خۆشە!!!.

## بۆ من فارغۆنم؟

٢٥١. لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٧٦ سەرەتای شۆڕش لە نێوان هەسەنادا و پەیسدا دەڕۆیشتن، عەلی شیعە بە ڕێگاوە خەوی لێدەکەوت و دەشرۆیی، پێی لە جێ پێی پێشەوەی کەسەکان دادەنا بۆیە بانگی پ.م کامەران دەکا و دەڵێ وەرە پێشەوە با تاوێ بخەوم، پێشمکەوە، کامەرانیش دەڵێت بۆ هاوڕێ عەلی شیعە من فارغۆنم تۆ بخەوی!!.

## خۆ دۆمینەی لەگەڵ ناکەین

٢٥٢. پێشمەرگەکانی هەرێمی یەک کە ئەوسا کاکە حەمەی حاجی مەحمودی فەرماندەی هەرێم بوو لە شارەزوور، هاتنە خۆشناوەتی لە ساڵی ١٩٨٠ دوو پێشمەرگەی هەرێمی یەک لە گوندی شیرەی خواروو لە دەرگای ماڵێک دەدەن، دەیانەوێت دابەش بن و دامەزرێن و نان بخۆن، ژنی ماڵەکە دەڵێت: پیاومان لە ماڵ نییە! پێشمەرگەیەک دەڵێت: پیاوتان لە ماڵ نییە چییە، خۆ دۆمینەی لەگەڵ ناکەین، نان دەخۆین و دەڕۆین!!.

## لە قوونڕا خزمین

٢٥٣. لیوا فوئاد عومەر چەلەبی ناسراو بە مولازم فوئاد ئەفسەر بوو لە سوپای عێراق ساڵی ١٩٧٢ ئاشکرا بوو کە پارتییە، بووە پێشمەرگە ،ئەوسا قەدەغە بوو لە سوپای عێراق خەڵک ڕێکخستن بیت، بەس دەبوو بەعسی بێت، بۆیە مولازم فوئاد کە پارتی بوو هاتە دەر ئیتر لەو ساوە بێ پسانەوە پێشمەرگەیە، ئەو ڕەسەنە هەولێرییە، خۆی و بابی و ئەژدادی لە قەڵاتی هەولێر لەدایکبووین، لە هەولێرییە تۆخەکانن! لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێوە پێشمەرگەیە، پاش نسکۆش ١٩٧٥ نەگەڕایەوە عێراق چووە سوریا، لە ناو (هـپ.ک) بوو، ئەندامی مەکتەب عەسکەری بوو، دوایی لە مەڵبەندی هەولێر لە ساڵی ١٩٨١ لێپرسراوی عەسکەری بوو لە گوندی وەرتێ! ناسیاوەتییان لەگەڵ وەرتەییان هەبوو،

خەڵک وای دەزانی وەرتێیین، پێشمەرگەکانی وەرتێی بوون، جارێک لێی دەپرسن خزمایەتیتان لەگەڵ وەرتێییان چییە، وەک باوە لە کوردەواری خزمایەتیی بەرو پشت هەیە خزمی بەرە هی دایکی و خزمی پشت هی باوکە بۆیە مولازم فوئاد هەولێرییانە دەڵێت: ئێمە لەگەڵ وەرتەییان لە قوونڕا خزمین، خزمی قونێین!! قوون واتە (قینگ)!!.

## ئەو ڕووبارە بزانین بە فەردە شەکرێک شیرین دەبێ!

٢٥٤. ساڵی ١٩٨٣ سامی شۆڕش و جەوهەر کرمانج و سەعدۆلا پەرۆش دێنە وەرتێ، وەرتێ گوندێکی خۆشە لە بناری کاروخ، بە دار و درەخت و کانی و کانیاوە و سازگارە و کوێستانی هەیە (کوێستانی مەکێ)! گوندێکی گەورە و فراوان و بە دیمەن و دڵگیرە! ئاوێکی سازگار و بەفراوی بە ڕووبار لەسەرەوەی گوندی وەرتێ هەڵدەرژێ، سێ مزگەوتی لەسەرە ،ئەو ئاوەی ئاودەستخانەی مزگەوتەکان تێکەڵ بەو ئاوە سازگارە دەبێت، ویستیان پڕۆژەی ئاوی بۆ بکەنەوە، پێیان خۆش نەبوو مەلای گوندی لە نوێژی هەینی فەرمووبووی باو باپیرانمان هەر لە ئاوە گوواوەیان خواردۆتەوە ئێمە پڕۆژەمان ناوێت، جارێک بە مەلای گوندی دەڵێن کە ئەو ئاوە پیسە، ئاودەستخانەی لەسەرە، مەلای گوندیش گوتبووی: پیسی چی، بچن بە فەردە شەکری

تێبکەن، بزانن ئەو ئاوە شیرین دەبێت!!! ئەو ئاوە سازگارە، ئاودەستخانەی مزگەوتەکانی هەر لەسەربوو، جا ئەو سێ شاعیرە (سامی شۆڕش) و (جەوهەر کرمانج) و(سەعدوڵا پەرۆش) دەچنە وەرتێ و لەو ئاوە دەخۆنەوە، شاعیرانە دەڵێن کوردستان ئەو ئاوەی هەبێت قەت ناڕوخێ، چ خۆشە ئەو ئاوە، پاک و سازگارە، کە دێنە لای مولازم فوئاد کە بارەگای لە وەرتێ بوو، هەمان قسە دەکەنەوە، مولازم فوئاد دەڵێت: ئاوی پاک و سازگاری چی، ئێوە گوواوتان خواردۆتەوە!! ئۆباڵ بە ملی مولازم فوئاد!!.

## پێویستت بە وڵاغە نەک سەیارە

٢٥٥. شەهید مامۆستا عەزیز ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بوو، لەسەر ڕێگای بێگلان بوون لە پشتێ (هەڵشۆ)، شەهید مامۆستا عەزیز هەرچەند کردی و کراندی پێی نەکرا باری وڵاغەکە ببەستێ، کابرای خاوەن وڵاغ هات و بە مامۆستا عەزیزی وت: برۆ بەولاوە بەو هەموو سمێڵەوە ناتوانی وڵاغێک باربکەیت، بە کەڵکی چی دێیت، مامۆستا عەزیزیش تۆزێک وەستا و وتی: ئەی تۆ دەزانیت سەیارە لێبخوڕیت، خاوەن وڵاغەکە واتە قاچاخچییەکە وتی: تۆ ئێستا پێویستیت بە وڵاغە نە سەیارە!!

## بەشەرت لەگەڵت دێین چەکمان نەکەی!

٢٥٦. نۆ کەس بوون لەوانە سەعدوڵڵا پەرۆش و جەوهەر کرمانج و خالید جووتیار و ... دەیانەوێ لە سەرکردایەتییەوە لەخڕێ نێرزەنگ و زەڵێدا بچنە وەرتێ، سەعدوڵلا پەرۆش و جەوهەر کرمانج خۆیان دەبەستن ، تاقمی مەخزەنی پڕ فیشەک و دەمانچەو ڕومانەو شایەلەی چەپ وڕاست وجەمەدانی ،پێشمەرگەی پۆشتەو پڕچەک و تفاق بەڕێ دەکەون بەرەو وەرتێ، پێشمەرگەیەکی ئەو ناوچەیە تووشیان دەبێ و ئەڵێت بۆ کوێ ئەچن ئەوانیش دەڵێن بەرەو وەرتێ ، پێشمەرگەکە دەڵێت: شارەزان؟ ئەوانیش دەڵێن ناوەڵلا ئەو ڕێیە دەگرین ڕاست و ڕاست وا دەڵێن دەگەینە وەرتێ، پێشمەرگەکە دەڵێت: کاکینە وا نابێت شارەزا نەبن چۆن دەڕۆن، ما دام من پێشدەکەوم وپێشانتان دەدەم وچاوساغیتان ئەکەم و شارەزام، با تووشی کێشە وڕوداوێک نەبن! سەعدوڵلا پەرۆش بە هەموو چەک و تفاق و ڕومانانەوە و کە نۆ کەسن بە پێشمەرگەکە دەڵێت: بەو شەرتە لەگەڵت دێین کە لە ڕێگا چەکمان نەکەیت!!! ئەوان نۆ کەسن و پێشمەرگەکەش بە تەنیا!!!!

## حەمتان

٢٥٧. محەمەد عەلی عەبدولرەحمان ئەڵماس لە خۆشەویستیدا باوکی پێی وتووە (حەمتان) لە ناو پێشمەرگە و شۆڕش و خەڵکدا ناسراوە بە (جەلال کوڵکنی) سەرتیپی ١٥ی شارەزوور بوو، پێش ڕاپەڕین. پێشمەرگەیەکی دلێر و لێپرسراوێکی ناسراوە، هەر بە جەلال کوڵکنی دەیناسن، کەم کەس دەزانـێ ناوی ڕاستی چییە! خۆشی بیری چوتەوە ناوی چی بووە! بۆیە لیستی پێشمەرگە دێرینەکان لە شـارەزوور دەکەن یەکەم ناو دەنوسێ (محمد عەلی عبدالحمن ئەڵماس) (حەمتان)، دەیخەنە بەردەم جەلال کوڵکنی، تەماشای لیستی پێشمەرگە دێرینەکان دەکات بە تووڕەییەوە دەڵێت درۆ دەکات لە ژیانیدا محمد عەلی عبدالحمن ئەڵماس (حەمتان) پێشمەرگە نەبووە، لایەن قابیلە پێشمەرگە دێرینەکان نەناسین! برادەران پێی دەڵێن بە پێکەنینەوە دەڵێن ناوی خۆتە، کاک جەلال کوڵکنی لەبەر ئەوەی فەرماندەیانە یەکەم ناوی ڕاستەقینەی دەنووسن!!!.

## من کوردم کورد

٢٥٨. نزار خەیلانی نووسەر و شاعیر، لە ڕێکخستنی (ی.ن.ک) بوو کەوتە ئەڵمانیا، لەوێش هەر کاری ڕێکخستنی دەکرد، لە ئەوروپا لەگەڵ کچێکی ئەڵمانی یەکتریان خۆش دەوێ وحەز لە یەکتر دەکەن، بەڵام کچە ئەڵمانیەکە لە خێزانێکی نازی بوو، دەستگیرانەکەی نزار خەیلانی، ناوی (گیزلا) بوو بە نزار خەیلانی

دەڵێت:ماڵەوە ڕازی نابن شوو بە بێگانە بکەم، بۆیە بە نزار خەیلانی دەڵێن خۆم قسە لەگەڵ دایکت دەکەم، وەختێک دادەنین لە شاری (بۆن) ساڵی ١٩٨٤، نزار خەیلانی دەچێتە لایان و ڕوو لە دایکی (گیزلا) دەکات کە ناوی (کۆرنیلیا) بوو و دەڵێت: بۆ (گیزلا) شووم پێنەکات، (کۆرنیلیا) دایکی کچەکە دەڵێت: ئێمە کچ نادەین بە بێگانە، نزار خەیلانیش (گیزلا) ی خۆشدەوێت و زۆر بە حەماسەتەوە دەڵێت: خۆ من عەرەب نیم، تورک نیم، فارس نیم، من کوردم کورد، (کۆرنیلیا) دایکی (گیزلا) دەڵێت: ئاخر کێشەکە لەوەدایە کە کوردی! عەرەب و تورک و فارس چییانە، ئەوانە دەوڵەتیان هەیە، ئاڵا و سەربەخۆیی خۆیان هەیە، بەڵام کورد چییە نە ئاڵای هەیە نە دەوڵەت!! سەرەنجام بۆ یەک بوون نزار خەیلانی و گیزلا هاوسەری یەکن و سێ منداڵیان هەیە بە ناوی (شۆڕش + سارا + کاردۆ)، (کۆرنیلیا) ش خەسوویەتی!!!

## کەس تێ نەگەیشتووە

٢٥٩. لە یەکی ئایاری ساڵی ١٩٨٣ لە دۆڵی خانەقا تیپی ٧٨ی کاروخ یادی جەژنی کرێکارانی جیهان دەکاتەوە، ئازاد جوندیانی ئاهەنگگێڕ دەبێت بە دەم مایکرۆفۆنەکەوە دەڵێت: (با بە گیانێکی مارکیسیزمی ولینینزمانە جیهانێکی ئەنتەر ناسیۆناڵ بنیات بنێن) عەزیز داود ناسراو بە عەزەی داود جێگری تیپی ٧٨ی کاروخ هەڵدەستێ و دەڵێت: تەلاقم کەوتبێ کەس لەو قسەیە تێنەگەیشتووە مەگەر خۆت تێبگەی دەڵێی ئینگلیزییە!!!

## چییە نان خواردنە!

٢٦٠. مەمەندی حاجی صدیقی، کۆیی بوو، بەڵام کەوتبووە ڕانیەی تێکۆشەرێکی کۆنی حزبی شوعی بوو، بەساڵچوو بوو ،دوایی بووە یەکێتی لە یەکێتیش ببووە (شۆڕشگێڕان)، پیاوێکی دڵتەڕ و قسەخۆش و بەکەیف بوو، سەر و سمێڵی ڕەش دەکردەوە، هەموو ڕۆژێک ڕیشی دەتاشی، جار بووە لەسەر سواری (هێستر) مەکینەی پاتری دەرهێناوە، ڕیشی تاشیوە، لە کۆبوونەوەی فراوان و ئاسایی بەناوی یەکێتیی شۆڕشگێڕانی کوردستان بەشداری دەکرد چونکە کادیری پێشکەوتووی شۆڕشگێڕان بوو، کە دەهاتە کۆبوونەوەکان پاڵی بە دار و کاریتەوە دەنا، گفتوگۆی نەدەکرد و خەوی لێ دەکەوت! جا لە بابەتی گرنگ و هۆشیاری بەخەبەریان دەهێنا و دەستیان لێ دەدا، کە چاوی دەکردەوە لە پڕ ڕادەپەڕی و ڕاست دەیگوت (چییە نانخواردنە؟)!!!!

## عومەر ڕوخاو

٢٦١. عومەر ئەحمەد قولی خەڵکی کۆیە بوو، لە ساڵی ١٩٨١ لە ناو ڕیزەکانی (ی.ن.ک) دا پ.م بوو بەڵام لە یەکەم ڕۆژەوە ڕووخا بوو، بۆیە ناونرابوو عومەر ڕووخاو لەگەڵ ئەو ناوە (عومەر گەرگول) یشیان پێدەوت، چونکە دەیگووت شۆڕش و پێشمەرگە پڕی گەرگولە، کاری ئەوەبوو پێشمەرگە بڕووخێنێ،

خۆشی لە گەڵیان تەسلیم نەدەبۆوە و بە رووخاوی قسەی دەکرد و پێشمەرگەی دەڕووخاند و تەسلیم دەبۆوە، ساڵی ١٩٨٧ دەیەوێت تەسلیم بێتەوە مامۆستا عەلی حەوێز و مامۆستا هەندرێن قسەی لەگەڵ دەکەن کە تەسلیم نەبێتەوە، پێی دەڵێن کە (ساحە)کە چۆڵ مەکە، عومەر ڕووخاویش دەڵێت: بەخوای هەر تەسلیم دەبمەوە و ساحەکەش چۆڵ دەکەم ئەگەر (سەد گۆڵیشتان لێ بکرێت)!!!.

## هەڵنەهاتوون

٢٦٢. ساڵی ١٩٨٥ ڕژێم بە سوپا و جاش و هێزێکی زۆرەوە هێرشی کرد وکێومالی ناوچەکەی کرد، مەفرەزە پێشمەرگەیەکی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر لە گوندی (بانی ماران)ی ولاتی کۆیە دەبن و لە ناو گوندی دەردەچن، بەرەو لوولە و هەرەتەکانی داربەسەر، پاشان هێزی دوژمن دەگەڕێتەوە، پێشمەرگەکانیش دەگەڕێنەوە و دەچنە گوندی (شاخە پیسکە) لەوێ جووتیارێک بە ناوی مام فەلاح لە پێشمەرگەکان دەپرسێت: بۆچی هەلاتن و ڕاتانکرد و شەڕتان نەکرد؟ پێشمەرگەکانیش دەڵێن: ڕامان نەکردووە و هەڵنەهاتووین (ئینسحاب) مان کردووە، مام فەلاح دەڵێت ئەی بۆ کوێ چوون، پێشمەرگەکانیش دەڵێن ئیختیفامان کرد، مام فەلاح دەڵێت: لەگەڵ شۆڕشی کۆن هیچ جیاوازییەکتان نییە تەنها هەلاتن بووە بە (ئینسحاب) و خۆشاردنەوەش بووە بە (ئیختیفا)!!!.

## بە چی!

٢٦٣. مەفرەزەیەک پێشمەرگەی قوەتی دەشتی هەولێر لە ساڵی ١٩٨٢ دەچنە گوندی (ش) سەعات ٤,٥ بەیانی دەبێت، چەند پێشمەرگەیەک لە دەرگای ماڵێک دەدەن بەو گەردی بەیانییە لە خەویان هەڵدەستێنن! ژنێک دەرگا دەکاتەوە، جلوبەرگی پیاوانەی لەبەرە، بەڵام بە توورەیی ونارەزایی جنێو دەدات و بە پێشمەرگەکان دەڵێت: دایک و خوشکتان واو وا لێبکەم، پێشمەرگەیەکیش سەیری پێدێت ئەو ژنە ئەو جنێوە ناشرینانە دەدات و جلوبەرگی پیاوانەشی لەبەرە، بۆیە دەڵێت: بەچی دایک و خوشکمان واو وا لێدەکەیت؟!!!

## عەیب ناکەن من کەرم هەیە

٢٦٤. خاڵە کاکەی نازەنینی لیژنەی پیتاک و پارە کۆکردنەوە بوو لە ساڵی ١٩٨٠ لە هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، دەچێتە گوندی (...) کۆبوونەوە بە خەڵک دەکات و دەڵێت: خاوەن جووتە هێسترێک دوو دینارە! خاوەن جووتە کەرێک یەک دینارە ناوی خاوەنەکان دەخوێنێتەوە، خاوەن هێسترەکان پارەکە دەدەن! لە پڕ کابرایەک بە تورەیی لە مزگەوت دەردەپەڕێ و بۆڵە بۆڵ دەکات، خاڵە کاکە دەڵێت بۆ دەڕۆیت، کابرا دەڵێت: عەیب ناکەن من کەرم هەیە و باستان نەکردووە، باجتان بۆ دانەناوم، خاڵە کاکە دەڵێت خۆت بێ عەقڵ مەکە، کەرەکەی تۆمان بە هێستر

حساب کردووە، کابرا پێدەکەنێت و پارەی جووتە هێستریک دەدات و تووڕەبوونی دەنیشێتەوە!!.

## حەدیقەی حەیواناتە

٢٦٥. پێشمەرگەکانی (ی.ن.ک) زۆربەی ناوی نهێنییان هەبوو، بەو نازناوە بانگ دەکران و دەناسران، ناوی نهێنی هەر سەردەمی شاخ بوو، بەڵام لە شار و دوای ڕاپەڕینیش ئەو نازناوانە نەسڕانەوە، کۆمەڵە پێشمەرگەیەک یاداشتێک بۆ مام جەلال دەنووسن، کە ئیش و کارێکیان بۆ دیاری بکات، ناوەکان دەنووسن و ئیمزای دەکەن و ناوەکان لەمانە بوون: مام فیل/ تیپی ٥٧ی سەگرمە، دێو حەسەن/ تیپی ٥١ی گەرمیان، ئەحمەد چەقەڵ، مام شێر، سەردار دان سەگ! مام جەلال کە ئەو ناوانە دەبینێت دەڵێت: ئێمە شۆڕش و پێشمەرگایەتیمان کردووە لە شاخ یان حەدیقەی حەیواناتمان داناوە!!!.

## زانیمان بۆ ئازای!

٢٦٦. پێشمەرگەیەکی خەڵکی گەرمیان لە تیپی ٥١ی گەرمیان بوو، هێندە ئازا وجەربەزە وقارەمان بوو، کون لە جەرگیا نەبوو، لە چاوی ماری نەدەترسا! هەموو پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان سەرسام بوون بە ئازایەتی و قارەمانێتی ئەو پێشمەرگەیە! نهێنییەکەیان نەدەزانی کە بۆ هێندە ئازایە! چەند

پێشمەرگەیەک لەگەڵی دەچنەوە ماڵێ! ژنەکەی دەبینن هێندە ناشیرین و ئێسک گرانە، وەک دەعبایە! پێشمەرگەکان دەڵێن زانیمان بۆ هێندە ئازا و قارەمانی چونکە دەوێری پەلاماری ئەو ژنە بدەیت و لەگەڵی بنوویت، چونکە ئەو ژنە زۆر بەسامە، هیچ ڕەبیە و سەربازگەیەک هێندە بە سام وترسناک نییە!!!.

## سنوور هەیە

٢٦٧. ساڵی ١٩٨٤ کادیرێکی سیاسی تیپی ٥١ی گەرمیان کۆبوونەوە بە گوندی شێخ حەمید دەکات لە بناری گل، کە لەگەڵ گوندی (برایم غولام) لێک نزیکن و ئاقاریان یەکە، کادیرەکە باسی سیاسەت و بابەتی کوردایەتی دەکات، لێ دەبێتەوە و تەواو دەبێت، دەڵێت کەوا کێ پرسیاری هەیە ؟، یەکێک لە خەڵکی گوندی (شێخ حەمید) لە کادیرەکە دەپرسێت ئەرێ کاکی کادیر (سنوور هەیە)، کادیرەکە دەحەپەسێت و سەیری پێ دێت، کە کابرایەکی لادێی و جووتیار ئەو قسانە بکات، کادیرەکە زۆر قسان دەکات و خەتای دوژمن وداگیرکەران دەگرێت، کوردستانیان وا پارچە پارچە و بەش بەش کردووە، سنووریان نەهێشتۆتەوە و سەرەنجام دەڵێت سنوور نییە، کابرای خەڵکی گوندی شێخ حەمید دەڵێت ئەوجا زانیم سنوور نییە بۆیە خەڵکی گوندی (برایم غولام) شەڕمان پێ دەفرۆشن و تەشقەڵەمان پێدەکەن و مەڕ و ماڵاتیان دێنە پاوانی ئێمە وزەرەر دەدەن، تومەز سنوور نییە!!!.

## مام جەلال هەر لە سەرێیە

٢٦٨. ساڵی ١٩٨٣ مام جەلال بنکە و بارەگای خۆی لە خڕێ نێرزەنگ وتوژەڵە و زەڵێیەوە گواستەوە، هاتە ناوچەی خۆشناوەتی دۆڵی بالیسان گوندی (خەتێ)، دلێری سەید مەجید لە سەرکردایەتییەوە بە بناری کۆسرەتی بەرەو گوندی خەتێ بۆ لای مام جەلال کەوتەڕێ لە گوندی (خدران) ی بناری کۆسرەت تووشی دەبن و بە دلێری سەید مەجید دەڵێن بۆ کوێ دەچی، ئەویش دەڵێت دەچمە سەرێ بۆ لای مام جەلال، ئەوانیش دەڵێن مام جەلال لە خوارێیە لە گوندی (خەتێ) خۆ لەسەرێ نییە!! دلێری سەید مەجیدیش دەڵێت: خوارێی چی؟ مام جەلال لە بنی بیریشدا بێت هەر لە سەرێیە!!.

## کارەبا نەگەیشتە گوندەکەمان

٢٦٩. گوندی (...) ساڵی ١٩٨٩ لە شارباژێڕ خەڵکی گوندی کۆدەبنەوە ، دەیانەوێت یاداشتێک ئیمزا بکەن بۆ هێنانی کارەبا و داوا لە دەسەڵاتداران بکەن و کارەبایان بۆ ڕاکێشن، گوندەکەیان بۆ ڕووناک بکەنەوە، یەکێک لەو خەڵکە ئەو یاداشتە ئیمزا ناکات و فشەی پێ دێت و نکوڵی لێ دەکات کە هەرگیز کارەبا نادرێتە گوندەکەیان، سەرەنجام کابرا تووڕە دەبێت و دەڵێت: چاوەڕێی کارەبا مەبن، کارەبا بێتە سەری (زەکەرم) نایەتە ئەو گوندە!! ڕۆژان ڕۆیی و گۆڕانی بەسەرداهات بەهۆی بارودۆخی

سیاسییەوە کابرا گیرا، هێندەی ئەشکەنجە دەدەن هیچ نادرکێنێ دوایی کارەبا لە هەموو گیانی دەدەن، کارەبا لەسەری زەکەری دەدەن، کابرا ڕاست پێدەکەنێت، جەلادەکان بە لایانەوە سەیر دەبێت و لێی دەپرسن بۆ پێدەکەنی ئەو ئەشکەنجەیەت دەدەین و کارەبات لیدەدەین، کابرا حاڵ و مەسەلەکە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئەوە کارەبا هاتە سەر زەکەرم، بەڵام هێشتا کارەبا نەگەیشتە گوندەکەمان!!!

## لە پەنا بەردێکن دەڵێن مەسئوولەکان جێیان خۆش وباشە

٢٧٠. شەوێک با و باران و بەفر و سەرما بوو، لە شاخی سورێن بوون ساڵی ١٩٨١، پێشمەرگەکانی حزبیَ سۆشیالیست، هەموو لە پاڵ بەردێکی گەورە نوایەک پەیدا دەکەن، تا ڕۆژ دەبێتەوە و بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە، هەر پێشمەرگەی پەنا بەرد و نوایەک دەبن، شێروان شێروەندی لێپرسراویان بوو، ئەویش وەکو پێشمەرگەکان لە پەنا بەردێک بوو، پێشمەرگەیەک لە پ.م لەتیف دەروێش حاتەم دەپرسێت وەزعت چۆنە؟ لەتیف دەڵێت خراپم، ئەی شێروان شێروەندی لەکوێیە؟ وتیان لەو پەنا بەردەیە، لەتیف دەڵێت مەسئوولەکان خۆیان لە جێگای خۆش و باش، لە جێی گەرم و نەرمن! خەمی ئێمەیان نییە، شێروان شێروەندی وەک ئەوان جێی ناخۆشە! دەڵێت بە گۆڕی شەهیدان

ئەبێت ببێتە شوێنەکەی من مادام وا خۆش و باشە، هەردووکیان لە پەنا بەردەکە دەمێننەوە!!!.

## خۆ مەوقیفی پاس نییە

٢٧١. ڕۆژێک لە هاوین پێشمەرگەکان لە قوولەچاغ دەبن لە لای قەیوان، وا بڕیاردەدەن سەعات سێی پاشنیوەڕۆ ئەو گوندە بەجێبهێڵن و بڕۆن، ساڵی ١٩٨١ هەندیک دەڵێن گەرمە بۆچی بەم گەرمایە بەڕێ بکەوین؟ هەندێکی دیکە دەڵێن مەوعیدە، شێخ مەنسووری حەفید دەڵێت خۆ مەوقیفی پاس نییە تا پاسەکە چاوڕێمان بکات، ئێمە بە پێ دەڕۆین کەی خۆش بوو و فێنک داهات دەڕۆین!!!.

## مەلا مانگا

٢٧٢. جارێک پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالیست لە گوندی کانی مانگا دەبن ساڵی ١٩٨٣، شەو حەرەسیات دادەنرێت و نهێنی شەو دادەنێن، (عارف عەلی ئەحمەد) حەرەس دەبێت زەلامێک مەلای گوندی کانی مانگا (مەلا ئەحمەد) تێپەڕ دەبێت و پێشمەرگەکە میلی چەک ڕادەکێشێت و دەنگی دەدا و هاواردەکات: زەلام کێی؟! مەلا ئەحمەد کانی مانگا مشەوەش دەبێت و دەشڵەژێت و دەڵێت: مەلا مانگای کانی ئەحمەدم!!

## ژنیت یان پیاویت

٢٧٣. ساڵی ١٩٨٣ پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالست لە گوندی (سۆلەمیش) ی شــارەزوور دابــەش دەبــن، یــەک دوو پێشمەرگە لە دەرگای ماڵێک دەدەن، ماڵەکەش دەرگا ناکەنەوە، دەڵێت پیاوتان لە ماڵ نییە! پێشمەرگەکانیش دەنگەکە بە دەنگی ئافرەت نازانن و بە دەنگی پیاوان دەچێت بۆیە دەڵێن: دەرگاکە بکەرەوە، نایەینە ماڵتان، بەس ئەوەندە بزانین، ژنیت یان پیاویت!!!

## هەی لەفسێی بەم!

٢٧٤. قادراغای مەمەنداغای نوورەدین، فەرماندەی تیپی ٦٨ی مامەندە بوو، لەسەرەتای شۆڕشی نوێیەوە پێشمەرگە و فەرماندەیە! تا بڵێی قسەخۆش و نوکتە بازە، مەراقی دووربینە! لە ناوچەی مەرگە و پشدەر لەگەڵ برادەرێکی لێپرسراو ساردییان دەکەوێتە نێوانەوە، ساڵی ١٩٨٠ ناحەز قسە دەهێنن و دەبەن، وای لێ دێت پێشمەرگەکانیش یەکتر دەبوغزێنن، لە هەر گوندێک بن تێکەڵی یەک نابن! قادراغاش بە کابرای لێپرسراو دەڵێت: ئێمە لە مێژە دۆستایەتیمان هەیە، یەکتر دەناسین لە باوباپیرەوە خۆشەویست و ناسیاوی یــەک بووین مــادام وایلێهات ناوی لێپرسراو دەهێنێت و دەڵێت: هەی لە فسێی بەم!! کابرای لێپرسراو ئەوە دەزانێت هێندەی دی ساردییەکەیان زیاتر دەبێت، کار دەگاتە مەکتەب عەسکەری، ملازم عومەر هەروەک لێپرسراو قسەیان

لەگەڵ دەکات ولێی دەکۆڵێتەوە، باسی ئەو جوێنەی قادراغا دەکەن کە داویەتی هەی لە فسێی بەم! قادراغاش دەڵێت: بەڵام گوتوومە لە فسێی بەم، فسە دەڕوات خۆ ناگیرێت، چییە خۆ نەم وتووە لە کونی قنگێی بەم ئەمە جوێنە! ئیتر دەست دەکەن بە پێکەنین و ئاشت دەبنەوە! دۆستایەتیی یەکتر دەکەنەوە!!.

## خۆ سێ بە چوار نییە

٢٧٥. ساڵی ١٩٨٢ جارێک لە گوندی قادر پێشمەرگەیەک لە دەرگای ماڵی عبدالرحمان دەدات، خاوەن ماڵ دەرگا ناکاتەوە! بارانیش بووە، خاوەنماڵ دەڵێت: پێشمەرگەیەکی خۆتان بە ناوی ئەحمەد لە دیوەخانەکە خەوتووە، جێتان نابێتەوە، پ.م یەک بە ناوی مەحموود دەڵێت: دەرگا بکەوە خۆ ئەحمەد سێ بە چوار نییە، دیوەخانەکەی گرتبێت!.

## تۆ تۆپێکت لە بیرچووە!

٢٧٦. لە ساڵی ١٩٨٠ پێشمەرگەکانی هەرێمی یەک لە قەسرۆکەوە بەڕێگاوە بوون لەسەر چەقەی خوار جەلی بەسەرکەمیندا دەکەون وڕاویان دەنێن دوو پێشمەرگە چەکەکانیان لەبەر ماندوویەتیان لێ بەجێ دەمێنێ! فەقێ ئەحمەد خەڵکی کەلار بوو کلاشینکۆفی لێ بەجێمابوو، حەمە فەرەج تەوێڵەیی بوو نارنجۆک ئەندازەکەی لەبیرچووبوو، نارنجۆک ئەنداز گوللەی

وەک هێلکە قاز وایە، زرمە و گرمەی زۆرە، تۆقینەرە، وەک تۆپ دەنگی دێت، بە دەم ڕێگاوە بوون لە نێوان جەلی و سماقوولی، حەمە فەرەج بە فەقێ ئەحمەد دەڵێت: چەکەکەت لەبیرچوو، فەقێ ئەحمەدیش ئەڵێت: تۆ توپێکت لەبیرچووە من قسە ناکەم، بۆ چەکێکی سووکی وەک کلاشینکۆف قسە ئەکەیت!!!.

## داری بێ دووکەڵ کامەیە!

٢٧٧. سەرەتای شۆڕشی ساڵی ١٩٧٦ پێشمەرگەکان لە چەمی زەڵم بوون حەزیان لە چا دەکرد، پێیان نەدەکرا ئاگر بکەنەوە، لەبەر ئاشکرابوون ئەو دەمە دوژمن زۆر بەهێز بوو، دار و بەرد ڕەبییە ودوژمن بوو، شێخ عەلی دەڵێت: داری بێ دوکەڵ بهێنن بۆ ئەوەی چای پێ لێ بنێن، دکتۆر تەها خەڵکی شار بوو هەر دەگەڕا بە حامیدی حاجی غالی دەڵێت: تۆ لادێیی پێم نالێیت داری بێ دوکەڵ کامەیە!!!

## بەردێکی نەرم

٢٧٨. پێشمەرگەیەک تازە ببووە پێشمەرگە، یەکەم ڕۆژی پێشمەرگایەتی بوو لە ساڵی ١٩٨٥، شەوێ گوتی لە کوێ بخەوم، پێیان گوت زەوی ڕاخە، ئاسمان بەخۆت دادە، بەردێکی نەرم پەیدا بکە بۆ ژێر سەرت، ئەو پێشمەرگەیەی کە تازە هاتبوو هەر لە دەوری خۆی دەگەڕا بۆ بەردێکی نەرم!!!.

## چ پێویستی بە لێنان نەبوو!

٢٧٩. لە بەهاری ساڵی ١٩٨٢ حەمە عەلی بەرزنجی و ئازاد وێندەنەرەیی لە تیپی ٣٧ی شارباژێر بوون، لە شارباژێڕ لە گوندێک دادەمەزرێن، لە ماڵی جوتیارێک، ماڵەکە گیای کولاویان بۆ دادەنێن، ئازاد وێندەنەرەیی دەڵێت: گەر بمان زانیبوایە گیامان بۆ لێدەنێن، لەو شاخ و داخە گژوگیا زۆربوو، خۆمان بە لەوەڕ دەهاتین، چ پێویستی بە لێنانی دەکرد!!!

## جاسووسی کێم!

٢٨٠. ساڵی ١٩٨٩ فەرماندەی گشتی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان دامەزرا، بارەگای لە زەڵێ بوو، حەوت ئەندامی هەبوو هەریەکەو بەشێکی بەڕێوە دەبرد، مام ڕۆستەم ئەندامی فەرماندەیی گشتی بوو، (ج.ی) لە بەشی پارتیزانی کاری دەکرد، هەر قسە و باسێک دەکرا، خواردنەوەیەک و فشقیاتێک، نەوشیروان مستەفا لە قاسمە ڕەش دەیزانییەوە، بۆیە هەموو نیگەران بوون، ئەو قسە و هەڵسوکەوت و نهێنییانە دەچنە دەرەوە، مام ڕۆستەم گومان لە (ج.ی) دەکات ،بۆیە لە بارەگای قاسمە ڕەش دەبێتە گفتوگۆ و مشتومڕیان، (ج.ی) بێ ئاگایی خۆی نیشان دەدات، مام ڕۆستەم سوورە لەسەر ئەوەی ئەو شتانەی لای کاک نەوشیروان باسکردووە، ئیتر مام ڕۆستەم دەگاتە تینی و دەڵێت: تۆ جاسووسی! (ج.ی)یش دەڵێت ئاخر

جاسووسی کێم؟ لەو کاتە گفتوگۆیان گەرم دەبێت، سێبەری کاک نەوشیروان دەردەکەوێت، دیار دەبێ! مام ڕۆستەم دەیبینێ و دەڵێت: جاسووسی مامۆستا نازمی، مامۆستا نازم ئەوکات ئەندامی مەکتەب سیاسی یەکێتی بوو، پیاوێکی بێکێشە و بێ وەی بوو، ئیتر ببووە گوزارشت لە ناو پێشمەرگە، کە نەدەوێران ناوی بە دەسەڵاتەکان بهێنن، دەیانگووت: خەتای مامۆستا نازمە، جاسووسی مامۆستا نازمە!.

## تۆڵەکە

٢٨١. لە بەهاری ساڵی ١٩٨٣ مەفرەزەیەک پێشمەرگە لە گوندێکی شـــارەزوور دەبـن، خـاوەن ماڵەکە لـەبـەر هەیوانێ دایاندەنێ وتۆڵەکەیان دەداتێ، هەر لەبەردەم ماڵەکە تۆڵەکە بۆ خۆی سروشتی ڕوابوو، تۆڵەکە بە پڕی و چڕێ بەرزببووەوە، پێشمەرگەکان دەڵێن: ئەوە بۆ تۆڵەکەتان بۆ لێناوین، خۆ بەر هـەیوان و بـەر ماڵەکەتان هـەمـووی تۆڵەکەیە، هەریەکەمان گوریسێکتان لە مل کردباین بۆ خۆمان لەبەردەم ماڵەکە لە ناو تۆڵەکە خۆمان دەبەستەوە و تێرمان دەخوارد!!!.

## ئەو نانە خۆشە بۆ بە خۆڕایی بخۆین؟

٢٨٢. ساڵی ١٩٧٧ پێشمەرگەکانی شـارەزوور لە چەمی ڕیشێن خۆیان شاردبـۆوە، لە شوێنێکی تـەڕ و ئـاودار، هەر

چوار دەوریان ئاو بوو، دکتۆر ڕەزا داوا لە پ.م تۆفیق دەکات مەتارەکەی پێ بدا، هەندێک ئاوی بداتێ، ئەویش دەڵێت یەک تنۆک ئاوت نادەمێ، هەمووی ئاوە، دوور بوون لە ئاوایی، ماڵێک پێدەزانێت خواردنیان بۆ دەبات لە نان و دۆ و پیاز و برنجی سوور، زۆریان پێخۆش بوو، شەهید عەلی شیعە لێپرسراویان بوو، گوتی ئەو نانە خۆشە بۆ بە خۆڕایی بخۆین، هەقە شەڕێکی پێبکەین، ئیدی دەچنە سەر ئەحمەد ئاوا و چالاکیەک ئەکەن و شەڕێک دەکەن بە نان و دۆ و پیاز و برنجی سوورەوە!!!

## وەگووپ

٢٨٣. (ح.ح.غ) حەز لە کچێک دەکات لە ساڵی ١٩٨٠، (ح.ح.غ) بە تامەزرۆوە هێندە ناودەمی ماچدەکات و دەمی لەسەر دەمی دادەنێ، هەتا هەناسەبڕی دەکات بۆیە کچەکە دەڵێت: کوڕە خنکیام وەگوپ وەگوپ!!.

## کلاوەکەت لە بیرچووە

٢٨٤. مامۆستا عەلی حەویز ئەندامی م.س بوو، هاتە دەشتی کۆیە ساڵی ١٩٨٣، لە هەر گوندێک کۆبوونەوەی دەکرد و خەڵکی کۆدەکردەوە، قسەکانی وەک یەک بوون وەک لەبەری کردبێ وابوو، جەمالاغای عەباساغای دۆندار، شێت نەبوو بەڵام خۆش وبەپەلار بوو، هەمیشە دروشم و قسەی ئێستگەی بۆ پێشمەرگە دەخوێندەوە، خۆی

لە دۆندار دەژیا بەلام کەس و کار و خزمی لە گوندی (خراپە) هەبوو، لە گوندی خراپە گویی لە قسەکانی مامۆستا عەلی حەویز بوو زۆر بە وردی و سەرنجەوە قسەکانی وەرگرتبوو، مامۆستا عەلی حەویز لە قسەکانیدا دەیگوت: مەمنوونی قوونی ئەو مریشکانە بین کە هێلکە بۆ پێشمەرگە دەکەن، د.خالید و عەلی عەسکەری و حسێن بابە شێخیان بە چەکی قورس شەهید کرد، دەستیشی لەسەر سینگی خۆی دەدا بەلیدان، بۆی دەهاتە سەر چۆک شیعرێکی سامی شۆڕشی کردبووە وتار، با هەتاوی چاوی منداڵەکان دەربهێنین، لەسەر سینگی ئافرەت مەمک نەڕوی، کورد نافەوتێ و حوشتر ناگاتە قەندیل، دوایی شعرێکی حاجی قادر کۆیی دەگوت تەگبیر بکەن بە بێ دەنگ، هەندەی پەندی کوردی دەهێنایەوە و دەیگوت عەیبە دەست بە کلاوی خۆمانەوە بگرین با نەیبا، با بیبا، ئیتر قسەی کۆبوونەوەکانی وەک یەک بوون، جەمالاغای عەباساغای دۆندار قسەکانی دەرخ کردبوو، مامۆستا عەلی حەویز هاتە دۆندار هەمان قسەی دووبارە دەکردەوە! جاروبار شتێکی کەمی لەبیردەچوو، یان قسەکانی پاش وپێش دەکرد، جەمالاغای عەباساغای دۆندار لە گوندی دۆندار دووبارە و هەمدیسان هاتە کۆبوونەوەکە، دەبینێ هەمان قسەیە! دوایی مامۆستا عەلی حەویز دەڵێ: کێ پرسیاری هەیە؟ جەمالاغای عەباساغا دەستی هەڵدەبڕێ، مامۆستا عەلی حەویز دەڵێ فەرموو، جەمالاغاش دەڵێ: مامۆستا کلاوەکەت لەبیرچووە، مامۆستا عەلی حەویز گووتی کام کلاو، لەتەنیشت و دەوروپشتی گەڕا، جەمالاغا دەڵێ: ئەو کلاوەی (با) دەیبا ... با بیبا!!!.

## پووشکەی بە قوونانی نەدەچوو

٢٨٥. کوڕێکی مێردمنداڵە هەبوو، جوانکیلە و تازە هەڵچوو بوو، ماڵیان لەسەر جادەی قیر و سەرەکی بوو، تێکەڵاوی فیرار وخەڵکی شار و بوو بوو، لە ساڵی ١٩٨٣ هەندێک لە فیرار وخەڵکی شار فێری خواردنەوە و شتی خراپیان کردبوو، دایکی کوڕەکە هەستی پێکرد وسکاڵای لەکن پێشمەرگەی کرد لە ناوچەکە دەیگوت: کوڕەکەم جاران پوشکە بە قوونانی نەدەچوو، ئێستا ئاروانی بە قوونانی فەراحن!!!.

## هەر خەونە!

٢٨٦. ساڵی ١٩٨٢ مام جەلال چووە بنکە وبارەگای حزبی دیموکراتی ئێران لە گوندی (مەزرا)ی کوردستانی ڕۆژهەلات ئەوسا حزب زۆر چەکیان هەبوو لەگەڵ قاسملوو بە دیداری یەکتر شاد دەبن، شەو دەمێنێتەوە، بەیانی مام جەلال هەڵدەستێ وبە قاسملوو دەڵێ ئەو شەو لە خەونما چەکی زۆرتان دەدایێ وبۆتان ئامادەکردبوون چەکەکان زۆر بوون! قاسملووش نەیدەویست بیدا گووتی: هەر خەونە!.

## لحێفک

٢٨٧. ساڵی ١٩٨٧ هێزەکانی (ی.ن.ک) بە فەرماندەیی ئازاد هەورامی لە بادینان بوون بەڵام زۆربەی ئاخاوتنیان شێوەزاری

سۆرانی بوو، دابەش دەبن لە ماڵێکی گوندی (کانی بلاّف) بۆ ئەوەی پاش نان خواردن بچنەوە مزگەوت پێشمەرگەیەک داوای بەتانی -لێفە-پەتوو دەکاتن بۆ خەو هەرچەند دەکات ماڵەکە نازانن مەبەستیان چییە سەرەنجام دەبێژێ ئا....لحێفک.

## بۆ پێشمەرگەیاتی باشە!

٢٨٨. ساڵی ١٩٨٣ کابرایەکی مەڕخواردەیی بناری خاڵخالآن لەگەڵ کوڕەکەی لە پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ی کەرکووک دەگەڕێت لە گوندی (گەلناغاج) تووشی کەرتێک پێشمەرگە دەبێت! (ڕەفعەت عەبدوڵلا) کە ئەوسا ڕابەری سیاسی کەرتی تیپی ٢١ی کەرکوک بوو، دەڵێت: ئەو کوڕەم هێناوە بۆ پێشمەرگایەتی، ڕەفعەت و ئەوان سەیریان پێدێ، لە کابرا دەپرسن بۆ دەیکەیتە پێشمەرگە، کابرای مەڕخواردەیی دەڵێت: وەڵاهی ڕاستی بێ کوڕەکەم گەلێک خوێری و بێ کەڵکە، بە کەڵکی ئیش و کار نایەت، بۆیە هەر بۆ ئێوە باشە!! بۆیە دەمەوێت ببێتە پێشمەرگە، پێشمەرگەکان تووڕە دەبن و دەیانەوێت لێی دەن ڕەفعەت عەبدوڵلا ناهێڵێ لێی دەن، کابرای مەڕخواردەیی دەڵێت بە خوای بێ کەڵکە، بەس بە کەڵکی پێشمەرگایەتی دێت! ئێوەش نایکەنە پێشمەرگە!!!

## بەس دژی (ئەلفی پێشەوە نەبن)

٢٨٩. لە شۆڕشی ئەیلول حەبیب محەمەد کەریم سکرتێری م.س ی (پ.د.ک) بوو، دەستەی ڕاگەیاندنی (پ.د.ک) دەچنە کن

سکرتێری حزب پێی دەڵێن ڕێنمایی وئامۆژگاریت چییه بۆمان دەمانەوێ پرست پێ بکەین بۆ ئەوەی بەو ئاڕاستەیەدا بچین حەبیب محەمەد کەریمیش دەڵێ: بەس دژی ئەلفی پێشەوە مەبن وەک ( ئەمریکا + ئێران + ئیسرائیل + ئیمپریالیزم + ئەقتاعی... ئیستعمار... ئیسلام).

## کا(مانگا)تە

٢٩٠. محەمەد ساڵح ئامێدی وسەرفراز نەقشبەندی ژن ومێرد بوون، دوای داخستنی ڕۆژنامەی (وڵات) لە هەولێر، کەوتنە زەڵێ، ساڵی ١٩٩٣ لەوێ ڕۆژنامەی (وڵات)یان دەردەکرد، یەک لەگەریلاکانی پەکەکە کاتێک دەبینێ (محەمەد ساڵح ئامێدی) بەتەنیا دەسوڕایەوە، لە دەستووری گەریلاکان نابێ بەتەنیا بیت چونکە گومان دەکەن لێی، بۆیە دەپرسێت هەڤاڵ (کا، مانگا، تە) محەمەد ئامێدی تووڕە دەبێ وادەزانێ گووتویەتی کوا مانگایەکەت (مانگا) بە تورکی مەفرەزەیە! وای زانی مەبەستی (سەرفراز نەقشبەندی) خێزانیەتی ڕۆژانە لەگەڵ ئەو دەهات ودەچوو ئێواران دەگەڕانەوە شوێنی حەسانەوەیان!.

## بە دووقەڵ فرۆشتمت

٢٩١. عەلی عەسکەری فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو ئەندامی م.س ی.ن.ک بوو، لەساڵی ١٩٧٧ هاتە خۆشناوەتی لەگوندی گرتک لەگەڵ سەعدی گچکە ئەندامی

سەرکردایەتی ی.ن.ک وفەرماندەی هەریمی(٨) بووا بۆ ئەوەی عەلی عەسکەری نەناسریت ناویان لینابوو (کاکەحەمە) دەچنە مالی کویخا ئەحمەدی گرتک، سەعدی گچەکە دەلیت ئەو میوانە کاکەحەمەیە، کویخا ئەحمەدیش دەلی ئەوە ناوی کاکەحەمە نییە، سەعدی گچکەش زۆر دۆستی کویخا ئەحمەدی بوو باشی دەناسی کاتیش شەو بوو ناوەخت بوو، دەلی ئەدی ئەوە کییە؟ کویخا ئەحمەدی گرتک دەلی: ئەوە عەلی عەسکەرییە! سەعدی گچکە دەلی: نا هەو نییە! کویخا ئەحمەد دەلی گەر ئەو بی شەرت بی بەو شەوە دوو خرتە قەلتان بۆ سەر دەبرم، سەعدی گچکەش دەلی وەللا ئەوە عەلی عەسکەریە! عەلی عەسکەریش ئاشکرا دەبی روو لە سەعدی گچکە دەکات دەلیت بە دوو قەل فرۆشتمت وئاشکرات کردم!.

## عەبدول حەلیم

٢٩٢. لەسەر پشتگیری کردنی (ی.ن.ک) بۆ (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران) دروستکردنی (هیزی پشتیوان) نوینەران ولایەنگرانی (ی.ن.ک) گیران لەئیران، نزیکەی (٥) مانگ گیران م.عەلی حەویز (ئەندام م.س)ی ی.ن.ک م.محسین عەلی ئەکبەر (لیپرسراوی پەیوەندییەکانی یەکیتی وئیران) وشەهاب عوسمان ئەندامی مەکتەبی راگەیاندن (ی.ن.ک) سەرەنجام ئازادکران بەهۆی نیوەنگیری عەبدول حەلیم خەدام (وەزیری دەرەوەی سوریا) بوو بەهۆی ئەمەوە ئازادکران ئەو سی زاتە هاتنەوە،

چوونە بارەگای حزبی دیموکرات لە نزیک (سەردەشت) ساڵی ١٩٨١ م.عەلی حەویز لە پلە وتەمەن لەوان گەورەتر بوو لەجیاتی ئەوان کەوتە قسە گووتی: بەهۆی عەبدول حەلیم حافزەوە ئازاد کراوین! کە پێ دەکەنن ئەوجا دەڵێت: ببورن عەبدول حەلیم خەدام!.

## با بچینە ئەو چەمە

٢٩٢. ساڵی ١٩٨٧ ئەکەی ئامە ولوقەی رەعنا وقەرە کرمانج لە بادینان دەیانەوێ بەزمێ بە د.ئیسماعیل بکەن، کە دکتۆری هێزەکانی بادینان بوو! ئەکەی ئامە دەڵێ دکتۆر زەکەرم بزانە شتێکی لێ نەهاتووە دکتۆریش دەڵێ نیشانم دە، ئەکەی ئامە دەڵێ لێرە نابێ خەڵک دەمانبینێ، وادەزانن چ دەکەین، بابچینە ئەو چەمە! جوان نییە، تۆمەز پلانیان داناوە بۆی، دەچنە چەمەکە زەکەری بۆ دەردەهێنێ دەیخاتە مستی! بەرەپکراویی، برادەرەکانی ئەکەی ئامە هەموو لە پڕ پەیدا دەبن، دەڵێن ئەوە چ دەکەن عەیبە، چۆن پێشمەرگە شتی وا ناشرین دەکا، دەبێ دەربکرێن ولە بادینان شاربەدەر بکرێن وسزابدرێن، چونکە دەبێت پێشمەرگە دەستو دەم وداوێن پاک بێ! د. ئیسماعیلیش لە ڕووی دڵسۆزی ومرۆڤایەتییەوە، هەراسان دەبێ، واقی وڕدەمێنێ دوایی دەزانێ پێی ڕابواردنە ئەوجا چەکیان لێ سواردەکات!.

## بۆ پێت ناخۆشە، مامە

٢٩٤. لەیەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٥/١٩ لایەنگرانی (ی.ن.ک) هاواریان دەکرد کێ ڕابەرە، مامە!، لەو سەرو وەختە پیرەژنێک سواری پیکابێک بووبوو، پیر وهەلا هەلا بوو، ددانی لەدەمی نەما بوو، چەپڵەی لێ دەدا، دەیگووت مامە، هاوڵاتیەک لەگەڵیان سواربوو بوو لایەنگری (ی.ن.ک) پێی سەیربوو ئەو پیرەژنە وا هاوار دەکات هەر لە پشتی پیکابەکە پێی دەڵێ: بەو تەمەنە ئەوە چیتە مامە مامە، خۆ منداڵ نی!

پیرەژنەکەش وا دەزانێ پێی ناخۆشە بۆیە: بۆ پێت ناخۆشە زیاتر هاوار دەکا چەپڵەش لێ دەدا چەندان جار دووبارەی دەکاتەوە، ڕووی تێ دەکات هەر دەڵێ: بۆ پێت ناخۆشە، مامە، مامە، مامە.

## عەرەبی بە باشی دەزانن

٢٩٥. ساڵی ١٩٨٨ ساڵی ئەنفال (قرچ وبڕکردنی میللەتی کورد) بوو (شێروان شێروەندی) ئەندامی سەرکردایەتی (ح.س.ک) حزبی سۆشیالیستی کوردستان بوو، لە داخان کە ئەو هەموو کوردە لە ختو خۆڕایی دەکوژن، لەناویان دەبەن، دەڵێ چ هەیە عەرەب هەیە نەیکوژی، عەرەب هەموو یەکن، دوایی دەڵێت: وەڵلا عەدنان مفتی وعادل مرادیش هەردووکیان ئەندامی م.س (حسک) بوون.ئیعدام بکرێن دەڵێن ئاخر عەرەب بە هەرحاڵ ئەوان بۆ؟ دەڵێ چونکە عەرەبی باش دەزانن.

## لێ دەن لەبنی

٢٩٦. ساڵی ١٩٦٣ بە ساڵی بەعسییان وحەرەس قەومی بەناوبانگە دەشلێن ساڵی هەڵات وهەڵاتەکە چونکە خەڵکی کۆیە زۆر ئاوارەبوون وگیران لەدینگە بەستران وکوژران وگوللەباران کران بۆیە خەڵکی کۆیە ڕوویان لە پشدەرێ کرد، منداڵەورتکە لە پشدەرێ هاواریان دەکرد بە کۆیی یەکانیان دەگووت:

**لێ دەن لەبنی مەنجەرێ**

**کۆیی هـــــاتنە پشدەرێ**

## خۆم خەفەتم کەمە!!

٢٩٧. کابرایەک پێشتر شوان بوو لە گوندێکی دیکە، دوایی بووە پێشمەرگە ساڵی ١٩٨٢ لە تیپی ٣٧ی شارباژێڕ، جا لەناو پێشمەرگە ئەوەی گێڕاوەتەوە، گوتبووی لە گوندێکی دیکە شوان بووم، لەپڕ هەواڵ هات باوکم وەفاتی کردووە خەڵکی گوندەکە ماکەرێکیان بۆپەیداکردم هەر ئەو ماکەرە لە گوندی حازربەدەست بوو دەست دەکەوت سواری ماکەرەکە بوو بوو لەنێوەڕێگا زەوقی هەستابوو، خەریکی ماکەرەکە بوو، لەتێنانی بوو ماکەرەکە دەڕۆیی دەجوڵایەوە وئەویش تەکانی دەدا ودەردەهات دەیگووت شۆ باوکەڕۆ هۆش باوکەڕۆ دەڕاوەستە خەفەتمان زۆرە، خۆم خەفەتم کەمە تۆش وا ئەکەی

## پیتزاو خولەپیزە:

٢٩٨. پۆلۆنیەکان ساڵی ١٩٨٢گیرابوون لە مەکتەبی عەسکەری داندرابوون، مولازم عومەر لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو پۆلۆنییەکان ئاگردانیان دووقاتی بێ دوکەڵیان داهێنا، دووقات بوو خۆڵەمێشەکە دەکەوتە بنەوە، پشکۆیەکە بەگەشاوەیی لەسەرەوە دەمایەوە، هونەرمەند بورهان محەمەد لەوێ بوو کە نانیان دەکرد بەیانیان بەدەنگە خۆشەکەی گۆرانی دەگووت، سەید مەجیدیش لەمەکتەبی عەسکەری بوو پێی خۆش نەبوو، بەگژ م.بەهادینی حەلیمی دا دەچوو دەیگووت بەو بەیانیە ئەو گارەگارە چییە دەیکەی بەهادینیش دەیگووت بەخوای من نیم یەکێکی ترە! ئاماژەی بۆ هونەرمەند بورهان محەمەد دەکرد، ڕۆژێک مولازم عومەر بە بورهان محەمەدی هونەرمەند دەڵێت پیتزا دروست دەکەم بۆتان، بەپەنیر وقارچک وهەویر، هونەرمەند بورهان محەمەد دەڵێت: خولە پیزە یان پیتزا چونکە پیتزا زۆر نامۆ ودەگمەن بوو لەپێشمەرگایەتی! نەبیسترابوو وەک پێویست.

## دەبێ گوناهی من چ بێت

٢٩٩. ساڵی ١٩٦٢ خالید دلێر گیرابوو لە گرتووخانەی (تسن) لەوێش سرودی (پێشمەرگەی بەهەڵمەتین)ی دانا، لەو گرتووخانەیەدا بوو عەبدوکەریم قاسم لێبوردنێکی بۆ ئەو

گیراوانە دەرکرد کەخۆیان بە قسەی ئەو (ڕزگارکردنی کویت) ناونووس دەکەن، خالید دلێر لەویش گواسترایەوە بۆ بەندیخانەی گشتی کەرکوک دوای ئەوەش بۆ نوگرەسەلمان بۆ ئەومەبەستە ئەم کۆپلە گۆرانیەی دانابوو:

**دەبێ گونـــــاهی من چ بێت**
**هەتا کـــەریم لێم خۆش بێت؟!**
**کەریمە شێت، لـــەمنی دەوێت**
**خۆمی بۆ بەکوشتدەم، لەکوێت**

## مام جەلال نابێ بەبێ مێوان گۆشت بخوات

٣٠٠. لە شۆڕشی نوێی (ی.ن.ک)سـالانـی (١٩٧٦-١٩٧٩) خەبات وپێشمەرگایەتی زۆر سەخت ونالەباربوو، شای ئێران نەڕووخابوو، شەڕی عێراق وئێران نەبوو نان وپارە وئازوقە وگۆشـت سـەخـت دەسـت دەکـەوت، ئـەوسـا لـە کۆبـونـەوەی سەرکردایەتی بڕیاردرا نابێ مام جەلال جاروبار گۆشت بخوات، مەگەر مێوانی هەبێ، مام جەلال ئەو بڕیارەی پەسەند کرد، بۆ سبەینێ قادر دۆشکەی نارد کە لێپرسراوی مەفرەزەکانی بوو، ڕایسپارد بچێتە گوندی شێنێ بە کوێخا عەولای شێنێ بڵێ بۆ نانی نیوەڕۆ مێوانی مام جەلالی بێ، کوێخا عەولای شێنێ ئەو مێوانداریەی پێ سەیربوو، بۆیە چوو، داوەتەکەی پێ خۆش بوو برادەرانی سەرکردایەتی زانییان کوێخا عەولای شێنێی مێوانە،

گیسک سەربڕاوە، هەستیان کرد! فیڵیان لە مام جەلال پێ ناکرێ، ناتوانن بڕیار لەسەر مام جەلال بسەپێنن، حەزی لە گۆشت بێ میوان پەیدادەکات، بۆیە سەرکردایەتی وەرامیان بۆ مام جەلال نارد با بە کەیفی خۆی بەپێی توانا ودەستکەوت با گۆشت بخوات، وازیان لەو بڕیارە هێنا!

## نامانبینی:

٣٠١. شێروان شێروەندی لەپاش ڕاپەڕین بەشێکی حزبی سۆشیالیست لەگەڵ (ی.ن.ک)تێکەڵ بوونەوە، بوە ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ک) ومەکتەبی عەسکەری وجا دەیگووت مام جەلال ئیشی بەیەکێک بێ دەیدۆزیتەوە ئەگەر لە کونی دەرزیش بێ هەر دەیبینێ، گەر ئیشی بە یەکێکی نەبێ نایبینێ ئەگەر بڕواتە بەردەمی هەردوو دەستت ڕاوەشێنێ لەبەرچاوی بڵێ هەڵەهەڵە بڵابڵا هەر نایبینێ، بۆیە ببووە زاراوەیەک لەناو پێشمەرگە ئەرێ نامانبینی!.

## گۆمەشینی

٣٠٢. فەرهەنگ گۆمەشینی گلەیی لە نەوشێروان مستەفا ئەمین دەکات لەملاولەولا کەوا کاک نەوشێروان سلێمانچیەتی دەکاتن، فەرهەنگ گۆمەشینی ونەوشێروان مستەفا یەکتر دەبین، نەوشێروان مستەفا ئەمین دەڵێ: بیستوومە گلەیت کردووە گوایە

من سلێمانچیەتی دەکەم، فەرهەنگیش دەڵێ بڵێ وایە وام گوتییە، نەوشێروانیش دەڵێ گومەشین گوندێکی بچووکە بەو گەڕی وگولیەی ناوتان لە خۆناوە گومەشینی، من بەو سلێمانیە عەزیمە مەڵبەندی ڕۆشنبیری وکوردایەتی چۆن سلێمانچیەتی نەکەم!

## کوڕەکەی خۆت کۆنتڕۆڵ بکە

٣٠٢. مام جەلال بڕوای بە ئاینی ئیسلام هەبوو، ڕۆژووی دەگرت وجاربەجار نوێژی دەکرد، چۆتە حەجیش لە ساڵی ١٢٦٢ کۆچییەوە، لە کۆیە تەکیەی تاڵەبانیان هەیە، باوکی مام جەلال (شێخ حیسامەدین) ڕابەری تەکیەی تاڵەبانی بووە لە کۆیە، لە ساڵی ١٩٨٤ چەندان مامۆستای ئاینی سەردانی مام جەلال دەکەن، مامۆستا (م-د) گلەیی دەکات لە ڕەفتاری هەندێ پێشمەرگەی بەڕێکخستن کۆمەڵە وبەباوەڕ مارکسیی ولینینی کە زیان لەسەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام باش نییە، گەلێ جار کاری نەشیاو دەکەن لەمزگەوتەکانی گوندەکان، نوێژ ناکەن ڕۆژوو ناگرن! وا بڵاوی دەکەنەوە کە خەڵک نوێژنەکا وڕۆژوو نەگرێ! مام جەلال دەڵێ: بەسەرچاو چیمان پێ‌بکرێ بۆ کۆنتڕۆڵکردنی پێشمەرگەکان وادەکەین درێخی ناکەین بەلام ئەوانە گەنجن، خوێن گەرمن، ماندوون شاخەوشاخ دەگەڕێن، شەڕ وداستان تۆماردەکەن! برسی وتینوو دەبن دوورن لەکەس وکاریان وەک پێویست ناتوانین فشاریان لێ بکەین وتێیان دەگەینین!

مامۆستا (م-د)وازناهێنێ دەڵێ جەنابت سەرۆکیانی، بەرپرسی یەکەمی هەموو خەتای تۆیە، لە ئەستۆی تۆدایە، جەنابت چۆن ناتوانی کۆنترۆڵی بکەیت!

مام جەلال بەنەرمی وهێمنی وەرام دەداتەوە دەڵێ: ژمارەی پێشمەرگەکان بە هەزارانە، سەر بە هەموو ناوچەکانی کوردستانن. هەریەکەیان خەڵکی شوێنێکە! کۆنترۆڵکردنیان ئاسان نییە، (مەلایەک ئەو ساڵە لاقەی مانگایەکی کردبوو ببوە هەرا لەکومەڵگای کوردەواری وابڵاوببوەوە مایەی شەرم وخەوش بوو، چۆن دەبێ مەلای ئاینی کاری وابکا، ناویان نابوو مەلا مانگا، مام جەلال گوتی ئەوە گوزارشت لە هەمووم مەلایەک ناکا وئەو مەلایە ئەو کارە خراپەی کردووە) هەموو مەلایەک کاری وا خراپ ناکا یەک مەلا وای کردووە، بۆیە پێشمەرگەکان زۆرن هەریەکەیان کوڕی باوکێکن بەڵام جەنابت یەک تاقە کوڕت هەیە، کوڕەکەشت ئەندامی ڕێکخراوی (شورا)یە کە ڕێکخراوێکی کۆمەنیستی توندڕەوە، زۆر لە پێشمەرگە وئەندامانی کۆمەڵە چەپڕەوتر وتوندڕەوترە! تکایە جەنابت پێش هەموو کەس کوڕەکەت ئامۆژگاری بکە وکۆنترۆڵی بکە، مامۆستا (م-د) قسەی نامێنێ وبێدەنگ دەبێ!.

## مەچنە دەرێ ئاشکرا دەبین ودەگیرێین

٣٠٤. مام جەلال ومام سالح شێرە وسمایل فەلاح ومەلا ماتۆڕ لە کەرکوک خانووەکیان بەکرێ گرتبوو لە گەڕەکی جولەکان لەنێوان شۆریجە ودەباخانان، بۆ کاری حزبی (پ.د.ک) لەساڵی ١٩٥٨ خۆیان شاردبۆوە مەلا ماتۆڕیش بۆ کاری حزبی نزیک ئەوان خانوویەکی گرتبوو دایکی لەگەڵ بوو، دایکی ناوی (پلکە خەچۆر)بوو، خورشید شێرە ئەودەم ن.چ بوو لە سوپای عێراق، دەهاتە ئەوێ تایپیستی لەگەڵ دەکردن وهاوکاریان بوو، لەو کاری حزبیە وخۆشاردنەوەدا لە گفتوگۆ ودەمەتەقێ دابوون مەلاماتۆڕ وسمایل فەلاح (تەتەری حزب)بوو لێک گیردەبن بەشەڕدێن، دەیکەنە هەرا ولێکدان، یەکیان دەڵێ بابچینە دەرێ بزانین کاممان دایکی یەکتر دەگێین، سالح شێرەش دەڵێ وەڵڵا مەچنە دەرێ گەر لەدەرێ شەڕێ بکەن ئاشکرا دەبین و دەگیرێین، دایکی هەمووان دەگێین، هەر لێرە ئەنگۆ دایکی یەکتر بگێن باشترە.

## پارتیزانییە یان وەحشی زانییە

٣٠٥. ساڵی ١٩٧٨ حامیدی حاجی غالی و کاکە حەمەی حاجی مەحموود لە (گلان گەردی) برادۆست دەبن کە بەفر و بەستەڵەک بووە، لەناو بەفر لێی خەوتبوون، سوپای عێراقی دێنە سەریان، حامید حاجی غالی خەوتبوو، کاکە حەمەی حاجی

مەحموودی هەرچەند دەکات حامید هەڵناستێ و سەرەنجام بە تەکان و ڕاوەشاندن لە خەو لەسەر بەفر هەڵیدەستێنێ، کاکە حەمەی حاجی مەحموود بە حامید دەڵێت: پێشمەرگایەتیت پێ ناکرێ! حامید سەیرێکی کاکە حەمەی حاجی مەحموود دەکات ودەڵێت: توخوا ئەوە پارتیزانییە یان وەحشی زانییە، لەسەر بەفر بخەوی و تا بەیانی بیبەستی!!.

## گیس گیس

٣٠٦. ڕۆژێک ساڵی ١٩٨٠ کاکە حەمەی حاجی مەحموود و حامیدی حاجی غالی لە شاخی سوورێن دەبن، حامد بانگی کاکە حەمەی حاجی مەحموود دەکات و دەڵێت: گیس، گیس، کاکە حەمەی حاجی مەحموودیش وا دەزانێ حەیوانە کێوییە و دەڵێت مەبەستی (گیسک)ە بۆیە پێی دەڵێت بۆ وەستاوی دە بیکوژە، تومەز حامد ئاخاوتنەکەی جیاوازە و مەبەستی (جەیش) بووە!!!.

## بۆ چاوم سەرف بکەم

٣٠٧. شەوێک لە زستانێکی تاریک و نوتەک و ئەنگوستە چاودا ساڵی ١٩٨١ پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالست ،بەو تاریکیی شەوە کە چاو چاو نابینێ بەڕێ دەکەون! پێشمەرگەیەک بە نارێکی و لاری دا دەڕوا کاکە حەمەی حاجی مەحموود لێی دەپرسێت ئەرێ بۆ بە ڕێک و پێکی بە ڕێدا نارۆیی؟، پێشمەرگەکە

دەڵێت: چاوم ناوە بە یەکدا، هێندە تاریکە چاوم نابینێ بۆیە چاوم نوقاندووە، مادام نابینم چاوم بۆ سەرف بکەم!!!

## بە ١٥٠ کیلۆوە خوا غەزەبی لێگرتووی!

٣٠٨. ساڵی ١٩٨٠ کاکە حەمەی حاجی مەحموود کادیر هەرێمی یەک لەناو (ی.ن.ک) جەولەی زۆر سەرکەوتووی کرد لە ناوچەی خۆشناوەتی، ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینی، ناویان نابوو ناقیلەی مام جەلالی، لە نێوان توتمێ و زینێ بەسەر هەوراز دەکەوێت، ئەوساش کاکە حەمە هەر قەڵەو و بەخۆ بووە، کابرایەکی خۆشناو یەخەی دەگرێت، پێی دەڵێت: مەڕ ومالآت زۆرە، وەرە با پێکەوە شەریک بین واز لە پێشمەرگایەتی بێنە! کاکە حەمەش دەڵێت وازم لێ بهێنە بەجێدەمێنم لە هەورازەکە، کابرا هەر هەوڵ دەدات وقسان دەکات پێی بسەلمێنێ! کاکە حەمە نایسەلمێنێ وپەسەندی ناکات، ئاخیری کابرای خۆشناو دەڵێت: بڕۆ چۆن خوا غەزەبی لێگرتووی بە ١٥٠ کیلۆوە کەوتوویتە دوای ئەو منداڵ و توالآنە!.

## سەری زەکەرتان بپێچنەوە!

٣٠٩. لە ڕۆژێکی بەستەڵەک و بەفردا، پێشمەرگەکان بە فەرماندەیی کاکە حەمەی حاجی مەحموود، لەناو بەفر وەزعیان زۆر خراپ دەبێت، ساڵی ١٩٨٠هەرچەندە کاکە حەمە لە پێشەوە

بەفرەکەی دەشکاند، لەوەبوو ڕەق ببنەوە بۆیە کاکە حەمە حاجی مەحموود پێیان دەڵێت: سەری زەکەرتان بپێچنەوە، چونکە سەرما لە سەری زەکەرەوە مرۆڤ دەکوژێت ،هەندێک لەو پێشمەرگانە پەڕۆ و شتێکیان پێنەبوو، کڵاوەکانیان کردە سەر زەکەریان، دوایی گەیشتبوونە ناو ماڵات و کڵاوەکانیان کردەوە سەریان، سەیریان پێ دەهات وپێکەنینیان دەهات!!!

## کۆمەڵەم

٢١٠. پاش ئەنفالەکان هێزەکانی پێشمەرگە بەرەو سەر سنوور کشانەوە، ڕۆژێکیان لە سەر سنووری عێراق و ئێران لە هەورامان ساڵی ١٩٨٨، دوای وەستانی شەڕی عێراق و ئێران کاکە حەمەی حاجی مەحموود دەبینێت، کۆمەڵێک پێشمەرگە لە ناو بەفر دانیشتبوون، وەزعیان خراپە و بەتانییان لە خۆ پێچابوو، سەرمایان بوو، حامیدی حاجی غالییان لەگەڵ بوو! کاکە حەمە دەپرسێت بۆ ناپەڕنەوە لە ناو ئەو بەفرە دانیشتوون، حامیدی حاجی غالی دەڵێت: ئێران ڕێگە نادا، ئەڵێن ئێوە کۆمەڵەن، کاکە حەمەی حاجی مەحموود سۆشیالست بوو، بە بازگەکە دەڵێن: ئەوانە یەکێتی نیشتیمانین! ئەوانیش دەڵێن کۆمەڵەین، دوای بە حامیدی حاجی غالی دەڵێت چیت وتووە، دەڵێ گووتومە کۆمەڵەین لە ناو (یەکێتی) دا ئەی بۆ ناڵێی یەکێتین، حامید دەڵێت: من مەبدەئیم هەردەبێ بڵێم کۆمەڵەم، کاکە حەمەی حاجی مەحموود دەڵێت: حاڵت جوانە لە ناو ئەو بەفرە!!!

## تۆپ

٣١١. لەشەڕی قەیوان وماوەت ساڵی ١٩٨٦ مام غەفوور فەرماندەی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بوو، سابیر ڕەسولیش فەرماندەی تیپی ٢١ی کەرکوک بوو، سابیر ڕەسول شارەزای هاوەن وتۆپ بوو لەسوپای عێراق پێش پێشمەرگایەتی فێر بوو بوو، جا هاوەنەکانی لەشەڕگەی قەیوان وماوەت دەتەقاند، مام غەفووریش ڕەسەدی بۆ دەکرد بەجیهاز هەر دەیگووت لیی نەداو کورتی کردو ئاودیو بوو، لەنیشانەی مەبەستی نەدەدا، مام غەفوور ئۆقرەی نەما ئەوسا قەناسەی پێ بوو بەجیهاز گووتی لە قوونی تۆپەکەت بەم خۆی لێ ی نەدا، سابیر ڕەسولیش گوتی لەقوونی تۆپەکەم دەبەی کە پێیان ناکەوێ منیش لەکونی لوولەی قەناسەکەت بەم

## واچووزایەوە

٣١٢. دروشمێک هەبوو پێش ئەنفالەکان، دەگووترا (یا دەفڕین یا دەتڕین) ڕژێمی بەعس ساڵی ١٩٨٨، بەهەشت قۆناغ بەناوی ئەنفال کارەساتێکی لەناوبردنی بەسەر گەلی کورد هێنا، بەهەزاران گوند تێکدران وبەهەزاران ژن ومنداڵ وپیر ولاو ئەنفالکران، هێزی پێشمەرگە بەپارتیزانی لە شاخ وئەشکەوتەکان بەشاراوەیی دەمایەوە، سەخت ودژواربوو نان خواردن وحەوانەوەش، ڕژێمی بەعس هەموو شوێنەکانی داگیرکرد خەڵک

وپێشمەرگە ئاوارەبوون وکەوتنە سەرسنوور وناو ئێران جا مام ڕۆستەم کەرکوکی دەیگووت نەک نەفرین وا ترین بۆیە وا چووزایەوە فرینەکە نەبوو، ترینەکە بوو.

## چۆن ماکەر لەناو ئەو هەموو نێرە کەرە دەبێ!

٣١٣. فەیمە کۆچەری لە گوندی ژالەی رەوەت (ڕەبات)ی ناوچەی سەنگاو لەدایک بووبوو، لەپێناوی پاراستنی زەوی و(ی.ن.ک) هەر چەک وخەنجەر ودەمانچەی پێ بووە (٥١) کەسی ئەنفال بوو، لەگەڵ ژنێک دەیەوێ ببێ بە پێشمەرگە، چەکی خۆی پێ بووە، دەچنە کن مام سالحی گۆر ئەسپ ئەوسا جێگری تیپی (٥١)گەرمیان بوو، (مام سالحی گۆر ئەسپ) قسە خۆش بوو، دەڵێن هاتوون بۆ پێشمەرگایەتی مام ساڵح دەڵێ چۆن دەبێ )ماکەر( لەناو ئەو هەموو نێرەکەرە بێ فەیمە کۆچەریش راست تفەنگەکەی لەشان دەهێنێتە خوار وفیشەک لەبەردەم قاچەکانی دەدا مام ساڵح گۆڕئەسپ هاوار دەکات مەکە وەڵا بابە تۆ نێرەکەری پێشمەرگایەتیت پێ دەکرێ!

## (گەلاڵمێو)

٣١٤. مام رۆستەم حەز لە یاپراغ وگیپە ناکات، حەزی لە گۆشتە زیاتر جارێک مولازم عومەر دەعوەت دەبێت، بە مام رۆستەم دەڵێ پێم خۆشە پێکەوە نان بخۆین بەس تکایە تەقەی کەوچک وملچەملچ نەکەی، یان توانج وقسەی ناخۆش نەکەی وقێزمان نەکەیتەوە.

مام رۆستەم دەڵێ بەڕاستە وەی بەسەرچاو، دەچنە داوەتەکە یاپراغ دەبێ، مام رۆستەم دەڵێ ئەوە یاپراخی بە گەڵامێوە بەتەرسی کەرێ دەچێ ڕوو لە کاک عومەر دەکاو دەڵێ: ژن کە سەریان لە خەنە دەگرن گەلامێوی لەسەر دادەنێن تا وشک دەبێتەوە جاری وا هەیە چۆراوگەی (خەنە)لەبن گەڵامێوەکە لەبن گوێی ژنەکە شۆڕدەبێتەوە، مولازم عومەر بێزی دەبێتەوە وای لێ دێت بڕشێتەوە نانەکەی ناخۆن.

## هێندە قونان بڵندناکات:

٣١٥. عەلی حەسەناغای شەروێتێ قسەخۆش بوو لەسەرەتای شۆڕشی نوێی پێشمەرگە بوو، رۆژێکیان سەردانی لێپرسراوێکی شۆڕش دەکات ئەویش لەجێگری خۆی بە ئاستەم دەبزوێت بەهەزار حاڵ بەخێر هاتنی دەکات! لە کوردەواریدا ناخۆشە ونیشانەی بێڕێزییە بۆیە عەلی حەسەناغا گووتبووی:

پەکوو ئەو کابرایە ڕۆحی چەند زلە، بۆیە کە دەچیتە لای هێندە قونان بڵند ناکات کێری وەبەرنێیت!.

## هێڵی پان

٣١٦. ی.ن.ک سەرەتا سێ باڵ بوو کۆمەڵە وبزوتنەوە وخەتی گشتی یان هێڵی پان کۆمەڵە ڕێکخراوێکی مارکسی ولینین وچەپ بوو، بزوتنەوە ڕێکخراوێکی نیشتیمانی شۆڕشگێڕ بوو، هێڵی پان(خەتی گشتی) دەیانگووت لەو ڕێکخراوە ناگەین د.کەمال

فوئاد دەیگووت هێڵی پان (خەتی گشتی) ڕێکخراوێکە سەری ماروهاری تێدا دەبێتەوە، بۆیە (قالە دێگەڵ) لەسەر هێڵی پان گووتبووی (قوزی پان)م بیستووە، بەڵام هێڵی پانم نەبیستووە!.

## دەنگم دا بە(سە)

٣١٧. لەهەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان منداڵەکانی سالح شێرە داوا لەباوکیان دەکەن، دەنگ نەداتە پارتی دەنگ بداتە یەکێتی، تکای لێ دەکەت ولێی دەپاڕێنەوە دەڵێن دەنگ بدە بە(سە) نەک دەنگ بدەی بەلایەنێکی دیکە، حەز دەکەن منداڵەکانی دەنگ بۆ یەکێتی بدات! دوای دەنگدان لێی دەپرسن دەنگت دا بە یەکێتی دەڵێ بەڵێ دەنگم دا بە (سە) ئێوە نەتانگوت دەنگ بدە بە (سە) ی ئێ دەنگم دا بە سەی! مەبەستی (ی.ن.ک)بوو ئەی ئێوە واتان نەگووت.

## باوکم خەڵکی سنەیە:

٣١٨. ساڵی ١٩٧٨ مام جەلال ود.مەحمود عوسمان لە دەراوی گورگان بوون لەبن شاخی (سەری کۆرەش)خۆپیشاندان لە کوردستانی ڕۆژهەلات بوو، جولانەوەی نارەزایی دەربڕین تا رادەیەک خامۆش بوو وەک پێویست نەبوو، مام جەلال لە د.مەحمود عوسمان دەپرسێت (لەسەرانسەری ئێراندا)خۆپیشاندان وهەڵسانەوە وراپەرین گەرمە تەنیا لەشاری سنەی خۆشەویست نەبێ! د.مەحمود عوسمان گوتی (خۆپێشاندان سەرتاسەری

وگشتگیرە لەویش دەتەقێتەوە) هاوڕێ جەبار (جەبار عەبدوڵلا حەبیب) لەوێ بوو گوتی (لە سنە ڕوونادات)مام جەلال گوتی بەچیدا دەزانی لەوێ هیچ ڕوونادات، هاوڕێ جەبار دەڵێ چۆن نازانم خەڵکی سنە هەر زۆر هیچ وپووچن! مام جەلال زۆری پێ ناخۆش دەبێ گوتی خەڵکی سنە قارەمانن ودڵی کوردستانن، باشە بەچی دەزانی خەڵکی سنە هیچ وپووچن؟.

هاوڕێ جەبار گوتی (مام جەلال باوکم خەڵکی سنەیە بۆیە دەزانم هیچ پووچن)!

## مادام حسابی سکپڕیت کردووە:

۳۱۹. لە ساڵی ۱۹۸۷ مەلا ئەحمەدی جەیران فەرماندەی کەرتی تیپی ۵۳ی شێروانە بوو، لەنێوان گوندی (تەپەگرووس وبانی مۆرد) دەبن لە گەرمیان، پێشمەرگەیەکی لە کەرتەکەی B.K.C هەڵدەگرت لەوێ بە مەلا ئەحمەدی جەیرانی فەرماندەی دەڵێت: چیتر B.K.C هەڵناگرم، شانم داڕزا وقورسە! ئیتر بەسە! مەلا ئەحمەد دەڵێ بۆ هەڵیناگری، ئەو دەڵێ: نۆ مانگە هەڵی دەگرم پێوەی بە هیلاک چووم، مەلا ئەحمەدی جەیرانیش دەڵێ مادام حسابی سکپڕیت کردووە دەبێت نۆ ڕۆژ ونۆ سەعاتی تریش هەڵی بگری، ئەوجا سکەکەت دادەنێی.

## ئێوە شیوعی کوێن؟

٣٢٠. لە کارەساتی هەکاری ساڵی ١٩٧٨ سەرکردەکانی (ی.ن.ک) بە کۆمەڵە وبزوتنەوە وخەتی گشتی گیران، هەندێکیان بە دیلی شەهیدکران، سەید کاکە ئەوسا ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بوو گیرا بوو، بە مولازم عومەر دەڵێ کە سەرکردایەتی (کملک)بوو واتە کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان بوو ئێوە شیوعی کوێن کەستان لەسەرتان بەجواب نایە ئەو قسە هەبوو دەگوترا شوعیەک بگیرێ هەموو دونیا دێنە سەرخەت وەک قاز دەقیقێنن.

## گۆشت

٣٢١. خەلیل دهۆکی نوسەر وشاعیر ورەوشەنبیر بوو خرکەڵە وقەڵەو بوو، لە ئێستگەی دەنگی گەلی کوردستان کاری رۆژنامەوانی دەکرد، ئەو سەردەمە لەشاخ گۆشت نیعمەت ونایاب بوو کەم دەست دەکەوت، لە هاوینی ساڵی ١٩٨١ لە هەواری تۆژەڵە دووپارچە گۆشت لە ناو شلەکەیەک بوو، یەک قاپ شلە بوو بۆ دووکەس، خەلیل دهۆکی هەر دووپارچە گۆشتەکەی تێ کرد وخواردی وبە بەرانبەرەکەی خۆی گووت (خۆشە) (نە)کابرای بەرانبەریشی وەک ئەو حەزی لە گۆشت بوو تامەزرۆ بوو، گوتی چوزانم تۆ خواردووتە! لە ڕاستیدا گۆشت خواردن لەو ڕۆژگارە هێندە خۆش وبەچێژبوو، جارێک هەر لەوێ بەخەلیل دهۆکی دەڵێن قسەیەکی خۆش بکە خەلیل دهۆکی راست گووتبووی (گۆشت) قسە لەوە خۆشترا!.

## شکور و سابیر بن

٣٢٢. ساڵی ١٩٨٧ خالید حاجی مەلا وباواجی حاجی مەلا لە تیپیی ٩٣ی کۆیە بوون لە دەشتی کۆیە دەچنە ماڵە ناسیاوێک کابرای خاوەن ماڵ ژنەکەی گوێ گران بوو، دوو کوڕیشی هەبوو بەناوی شوکر وسابیر دەڵێت ژنەکە دوو کەڵەشێران سەرببڕە بۆئەو مێوانە ئازیزانە، پێش مەرگەکان لەشاخ وشەڕ هاتبوونەوە خۆشی خۆشی کەڵەشێر دەخۆن، کە دەچنەوە بۆ نان خواردن شلە ساواریان بێ گۆشت بۆ دادەنێت پێشمەرگەکان دەڵێن کوا گۆشتی کەڵەشێرەکان خاوەنماڵ دەڵێ: بخۆن شکور وسابیر بن، بەخوا ژنەکەم تێ نەگەیشتووە یەک لەپێشمەرگەکان هەرجارێکی پارووی لە شلە ساوار دەدا دەیگووت هەی دایکی (شکور) بگێم هەی دایکی (سابیر) بگێم کوڕەکان (شکور وسابیر)گوێیان لێ بوو پێ دەکەنین!.

## بەیادی مارکس وکوردستان

٣٢٣. مام جەلال ساڵی ١٩٦٥ بەسەردان دەچێتە بەریتانیا، لەوێ داوا لەهۆمەر شێخ مووس دەکات سەردانی گۆری (مارکس) بکەن لەناوچەی (های گەیت)بوو، کەدەچن مام جەلال دەچێتە سەرگۆڕەکەی دەستی بەرزدەکاتەوە دەڵێ(الفاتحة)هۆمەر شێخ مووس پێ دەکەنێ سەیری پێ دێت مام جەلال فاتیحە لەسەر گۆڕی مارکس بخوێنێ ودەڵێ: یەک شەموان کەش وهەوا خۆش دەبوو مارکس لەگەڵ منداڵەکانی دەچووە باخی (هامستیدهیث)بۆ

ئەوەی سواری کەربێ لەگەڵ منداڵەکان» با ئێمەش بچین بۆ ئەو پارکە، گوێ درێژێک بگرین بەیادی مارکس وکوردستان!.

## سلم نفسک

٣٢٤. ساڵی ١٩٨٣ تیپی ئاسۆس بۆسەیەک دادەنێنەوە لەسەر جادەی دوکان بۆ هەندێ سەرباز عوسمان شارستێنی ومەحمود سیدەری لەگەڵدابوون مەحمود سیدەری دەڵێت فێرە هەندێ وشەی عەرەبیم بکەن بۆ ئەوەی تەسلیم بن بە عەرەبی پێیان بڵێم بۆ ئەوەی تەسلیم بن ونەکوژرێن، گووتیان پێیان بڵێ(سلم نفسک) لەشەڕەکەدا کە لەسەربازەکان دەدەن مەحمود سیدەری هەستایە سەرپێ وتەقەی لێ کردن گووتی برایان بەو خوایەی (سلم نفسک)م لەبیرچۆوە ئەرێ چییان پێ بڵێم!.

## من پێشیان دەکەوم با من بکوژرێم!

٣٢٥. فازیل کەریم ئەحمەد (مامۆستا جەعفەر) لە کتێبی (بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ) نوسیویەتی(هەڤاڵەکانی عوسمانی قالە منەوەر، ئەو کاتەی یەکێتی بوو، هەر بۆ سوعبەت، لە هەر شوێنێک مەترسی نەبوو بێت، گووتویەتی: ئێرە هەر زۆر ترسناکە من پێشتان دەکەوم، ئەگەر بۆسە وتەقە بوو، با من بکوژرێم! ئەگەر بیزانیبایە لەو شوێنەدا مەترسی هەیە دەیگوت: هیچ نییە ویەک دەنک مەترسی نییە، یەکێکتان با پێش بکەوێت.

## نەیدەیە کەلکەسماقی

٣٢٦. ئاشتی سابیر میرە فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٩٣ی کۆیە ساڵی ١٩٨٧ لە شەڕی کەلکەسماقی لە ئێشگری وبەرگری ولە سەنگەر بوو، ئاشتی بە چەند کەسێک لەو پێشمەرگانە دەڵێ: بچوون ئاو ونان بهێنین لە گوندی ئیلەڵڵا بەقسەی ناکەن، سەرەنجام بە مەجید کافرۆشی دەڵێ: بچوو هەندێک نان وئاو بهێنە، مەجید کافرۆشی دەڵێ: بەو هەمووە پێشمەرگەت گۆت نەچووین، منیش ناچم، ئاشتی دەیەوێ دیسپلین بەکاربهێنێ دەڵێ دەبێ هەربچی، ئەویش دەڵێ ناچم، ئاشتی خۆی لێ توند دەکات دەبێت هەر بچیت، چەند جار پێی دەڵێتەوە کەبچی سەرەنجام مەجید کافرۆشی دەڵێ: ئاشتە وازم لێ بێنە ئەمن گەلەک کەرم با نەیدەمە کەرایەتی، جا مەجید کافرۆشی نکوڵی لە شتێکی بکردبا پێیان دەگووت (نەیدەیە کەلکەسماقی).

## بە ناوساجی، دەبتە بورجوازی

٣٢٧. ئازاد سەگرمە لە قەندیل ١٩٧٨ قاپێکی بن قووپاوی ڕەشداگەراوی لەسەر ئاگر دانابوو، ناوساجی دروست دەکرد، مام جەلال بە مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد) ئەندامی م.س و لێپرسراوی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک) دەڵێ: ئێوە کادیرەکانتان فێری ڕەوشتی بورجوازی دەکەن مامۆستا جەعفەر دەڵێ: (بە چی.. بە ناوساجی)، دڵنیام مارکس ولینین وماوتیستۆنگ ناوساجیان نەبینیوە، ئەگینا بەخواردنی پرۆلیتاریایان دادەنا!

## بەهەولێریان ناچی

٣٢٨. لە ساڵی ١٩٨٨ لە لەندەن مام جەلال وجەمالاغا وسەعدی پیرە ود.بەرهەم! سەعدی پیرە قسەی جوان وژیرانە ولۆژیکانەی دەکات، جەمالاغا سەیری پێ دێت چونکە جەمالاغای حەکیماغا عەشقە سلێمانی وسروشتی وابوو بادینی وهەولێری زۆر نەدەحوباند! بۆیە دەڵێ ئەو سەعدییە بە هەولێری ناکا، سەعدی پیرەش دەڵێ ئاخر دایکم سلێمانییە! جەمالاغا گوتی: ئەم ووت باشە کچی کێ یە لە چ بنەماڵەیەکن! سەعدی پیرە دەڵێ: نامەوێ باسی بکەم چونکە کێشەی کۆمەڵایەتیمان هەیە جەمالاغا دەڵێ چۆن! دەڵێ دایکم ڕەدووی بابم کەوتی یە! جەمالاغا زۆری پێ ناخۆش دەبێ دەڵێ: دایکی خۆی بە ڕەدووکەوتن ئەخا بەس حەیای سلێمانی ببا!

## لێکدانەوەی خەون وباوەش

٣٢٩. سواراغای عەباساغای سەرکەپکان فەرماندەی هەرێمی (١٤)ی ئاکۆ بوو لەساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٥ د.مشیر ڕابەری سیاسی هەرێمەکەی بوو، نێوانیان خۆش بوو، دۆستایەتی وبرادەرایەتیان ڕەگی قوولی هەبوو، لە ساڵی ٢٠١٥ سواراغای سەرکەپکان، تەلەفۆن بۆ د.مشیر دەکات دەڵێ: خەونم بە ماڵی مام جەلالەوە بینیوە، دەبێ چی بێ؟ د.مشیر ڕاوەستە ئەوە لێکدانەوەی دەوێ دەڵێ ئەگەر خەوت بە شێخ عەلی شێخ حەمە ساڵح بینی بێ، ئەوە بێ ئیش دەبێ، ئەگەر خەونت بە ئاکۆی شێخ جەنگی بینیبێ

ئەوە قەڵەو دەبی، ئەگەر خەونت بە لاهوری شێخ جەنگی بینیبێ ئەوە دەبیە لێپرسراوێکی گەورە! ئەگەر خەونت بە شێخ سەلاحی شێخ شەرەفەوە دیبێ، تووشی نەخۆشی شەکرە دەبی. ئەگەر خەونت بە ئاراس شێخ جەنگی یەوە بینیبێ ئەوە زۆر دەوڵەمەند دەبی، سواراغاش دەڵێ: بەگۆڕی کاکە باسی خەونم حەینەن بە ئاراس شێخ جەنگی یەوە بینیوە، د.مشیر دەڵێ: تەواوە کەواتە زۆر دەوڵەمەند دەبی!. جارێکی دیکە کابرایەک دێتە لای د.مشیر دەڵێ: لاهور تەمەنی هەیە وپیرە! د.مشیر دەڵێ کاکە کابرا گەلەک گەنجە تۆ خۆ باسی زەمانی شێخ ئەحمەدی هیندی لاهور ناکەی! کابرا دەڵێ: دەبێ بەتەمەن بێ وپیربێ! د.مشیر دەڵێ کاکە تازە پێدەگات من دەیناسم ومردووت مرێ بە منداڵی چەند جارم لەباوەش کردیە! ئێستا بەڵام ئەو ئەستێرەی گەشە ولێپرسراوێکی گەورەیە وبەدەسەڵاتە پێویستە بەو تەمەنەوە بەسەر سپیەوە لەباوەشم بگری!.

## بۆ تازە زانیوتە؟

٢٣٠. کەسایەتی کوردستانی هۆمەر شێخ مووس خەڵکی ڕۆژئاوا، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (ی.ن.ک) وئەندامی م.س، ساڵی ١٩٧٩ هێزێکی گەورە دەیەوێ پەلاماری بنکە وبارەگای سەرکردایەتی (ی.ن.ک) بدات (هۆمەر شێخ مووس) ئەحمەدی دادی ودلێری سەید مەجید ومحەمەد سیاسی ڕادەسپێرێ ئازووقە پەیدا بکەن، محەمەد سیاسی وئەحمەد دادی زوو هاتبوونەوە بەڵام دلێری سەید مەجید زۆر دوا دەکەوێ دەچێتە

تاران، درەنگ گەڕایەوە هۆمەر شێخ مووس زۆر تووڕە دەبێ، برادەرانی م.س بەرگری لە دلێری سەید مەجید دەکەن، هۆمەر شێخ مووس لە ڕقان (ئیستیقالە) نامەی دەستلەکارکێشانەوە دەنوسێ بۆ نەوشیروان مستەفا ئەمین ومولازم عومەر زۆریان هەوڵدا سوودی نەبوو، تووڕەبوونەکەی نەدەنیشتەوە سەرەنجام جەمالاغا دەنێرن، جەمالاغا دەچێت. هۆمەر شێخ مووس ئێجگار تووڕەیە بە جەمالاغا دەڵێ: من مامۆستام لە سوید کوردی ڕۆژئاوام وئێشم چییە لیرە! هەمووی سەگ وسەگبابی خۆمە! جەمالاغاش دەڵێ: بۆ تازە زانیوتە سەگ وسەگبابی! ئیدی هۆمەر شێخ مووس پێدەکەنێ نامەی دەست لەکارکێشانەوەکەی دەدڕێنێ!.

## حکومەت سیق ودیق دەکا

٢٣١. قادری عومەرە گۆلی شەوگێری پێش ناوی سەربازی لەتیپی ٩٣ی کۆیە پ.م بوو، تەمەنی لەسەرووی ١٨ ساڵییەوە بوو، بەڵام بەرەگەزنامە وناسنامە وابچووک نوسرابوو، لە مام عومەری باوکی دەپرسن لە گوندی (یارەمیش)بوو کە ساڵی ١٩٨٣ گەرمەی شەڕی عێراق وئێران بوو، بەهەزاران سەربازی ڕاکردوو لەگوند ودەشت وشاخ وپەناوپێچان بوو لەبەر ئاگری شەڕی عێراق وئێران! دەبوونە پێشمەرگە یان خۆیان لە دەشاردەوە لەناوچە ئازادکراوەکان حەوابوونەوە، بۆ لەدایک بوونی کوڕەکەت وا بە بچووکی نوسیوە! لەمێژە ناوی سەربازی هاتووە، گوتی: ئێمەی کورد هەمیشە لێمان دەقەومێ! کارەسات

وراكەراكمانە! شەڕ وئاژاوەمان لەپێشە عێراق لەشەڕ وكێشەیە، بۆیە كوڕەكەم بە گچكە نوسیوە، حكومەت سیق ودیق دەكا تا ناوی لەسەربازی دێتەوە! بۆیە وام كردووە!!.

## رەشید عارف مستەفا

٣٣٢. رەشید عارف سەقا بەڵێندەرێكی گەورە ودەوڵەمەند وخێرخوازبوو، چاپخانەی بۆ پارتی دیموكراتی كوردستان كڕی بوو، خەڵكی كۆیە بوو، هاوینان سەردانی ئەورووپای دەكرد، یارمەتی خوێندكارانی كوردی دەدا، زۆربەی خوێندكارەكان چەپ بوون دەیگووت كوڕینە ئەو گەنجەی تەمەنی ٢٥ساڵی نەبێتە كۆمۆنیست ئەوە (كەرە)، بەڵام ئەگەر پاش ئەو تەمەنە بەپێنج ساڵ هەر بە كۆمۆنیستی مایەوە ئەوە بزانن كەرترە!.

ساڵی ١٩٥٩ (میكۆیان)وەكو وەزیری بازرگانی یەكێتی سۆڤیەت سەردانی عێراق دەكات! چاوی بە بازرگانانی عێراقی دەكەوێت رشید عارف سەقا یەكێك لە بازرگانە ئامادەبووەكان دەبێت، بە(میكۆیان)ی دەناسێنن دەڵێن رەشید عارف سەقا گەورە سەرمایەدارێكی كوردە، (میكۆیان) بەگاڵتەوە دەڵێت: لەهەموو جیهاندا ئەوە یەكەمین جارە (سەرمایەداری كورد) دەیبینم، رەشید عارف سەقاش دەڵێت(جەنابیشت یەكەمین كۆمۆنیستی (ئەرمەنی)یە لە هەموو جیهاندا ببینم!.

ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی (ئەریك روولۆ)لە ڕۆژنامەی(لۆمۆند)بڵاویكردبۆوە گووتویەتی(عەرەبەكانی عێراق لێمان دەپرسن كەچۆن دەزانن سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی

لە کوردستان کوییە) لەوەلامدا پێیان دەڵێم حەکەمێک لەخۆتان هەڵدەبژێرن، ئەویش حوشترە، با حوشترێک لە بەغداوە بەرەو کوردستان بگرین لەکوێ حوشترەکە راوەستا ئەوە سنووری کوردستانە لەبەرئەوەی دەزانم لە چیای حەمرین بەولاوە ناڕوات!.

## جان(هۆمەر شێخ مووس)

٢٣٣. هۆمەر شێخ مووس لە ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨١ وەک کارگێڕی م.س (ی.ن.ک) کاروباری ڕۆژانەی مەکتەب سیاسی بەڕێوەدەبرد، جا کە گەرابۆوە لە ئەوروپا، پووتێکی جوان وسەربەخوری لەپێ بوو. جا هاتە لقی سێی (ی.ن.ک) لە (زەڵێ) زستان بوو، پێشمەرگە هەموو پێڵاوی لاستیک وقوڕاوی بوو، خۆی بەبارەگادا دەکرد، هۆمەر شێخ مووس کە ڕۆیشت، پڵاوەکەی لەوناوە کەوتبوو، بەقوڕ بوو بوو، گوتی دەزانن ئێوە حورمەتی پێڵاو ناگرن، هۆمەر شێخ مووس خەڵکی(عامووده)ی ڕۆژئاوای کوردستان بوو، بەڵام سۆرانیەکی هێندە جوانی دەزانی (جان)ی زۆر بەکاردەهێنا بۆیە بە (جان)ناوی دەهات مەبەست لەهۆمەر شێخ مووس بوو، کەم پێشمەرگە دەیزانی هۆمەر شێخ مووس خەڵکی عێراق نییە وایان دەزانی خەڵکی دەشتی کۆیە ودەشتی هەولێر وگوندی (گۆزەپانکە)یە!. هەم تێکەڵاو وکۆمەڵایەتی بوو، چەندان برادەری سۆرانی هەبوو جارێک بەبادینی قسەی دەکرد لەگەڵ یەکێک، پێشمەرگەیەک گوێی لێبوو گوتی چما کاک هۆمەر بادینی دەزانی لەکاتێکدا چەند زمانی زیندووی جیهانی دەزانی! نەیان دەزانی لەڕاستیدا خۆی بادینی یە.



مام جەلال



مەسعود بارزانی



د. قاسملۆ



عەلی عەسکەری



نەوشیروان مستەفا



د. فوئاد مەعسوم



دکتۆر خالید



سەعدی گچکە


کۆسرەت رەسول


هۆمەر شێخ مووس


د. بەرهەم سالح


ملازم عومەر



قادر عەزیز



عومەری سەید عەلی



محەمەدی حاجی مەحمود



سەید کاکە


د. کەمال فوئاد


مستەفا چاورەش


مه لا ناسیح


فەرەیدون عەبدولقادر



رەفعەت عەبدوڵڵا



دکتۆر خدر



عومەر فەتاح



سەعدی ئەحمەد پیرە



ئاسۆی شێخ نوری



عەدنانی حەمەی مینا



کوردۆ قاسم



بەکری حاجی سەفەر



ئازاد هەورامی



حامیدی حاجی غالی



فەرید ئەسەسەرد



نوری ئەحمەد تەها



عەلی باپیر



حەسەن کوێستانی



ئیبراهیم جەلال



دلاوەر ئەحمەد مەجید


ڕەشید عارف سەقا


قادر دێگەڵ


خارە کەمال


حەمە بەگرەز



جەبار یاوەر



بەشیر موشیر




سالح شێرە



مامە ریشە



ئازاد محەمەد غەریب ناسراو بە
(ئازادی سەگرمە)




سامی شۆڕش



ئاشتی سابیر میرە



قارەمان تیمار



میران فوئاد مەستی



ئازادی حەمە گەمحان



خەبات بچکۆل



حەمە عەلی بەرزنجی



مولازم فوئاد



باواجی حاجی مەلا



سەعدوڵڵا پەرۆش



سمایل فەلاح



عەبدوڵلا بۆر



حەمید باتاسی



خورشید شێرە



حەسەن عەوێنە


عەبەرەق


خەلیل سەراوی


خالید حاجی مەلا


حاجی مامز



مام غەفوور




حەمید قالە دزەیی



مەلا شاخی



نەسرەدین هەورامی



ڕەفعەت ئیناخی



مامە غەفە



حەمە سەقەر




خدر پاشای دزەیی



سەید برایم



شێخ جەنگی



ئەنوەری حەلاو



حاکم پێشڕەو سەید برایم



دڵزار بەکر ئاغا، میران مەستی



لاهور شێخ جەنگی



ڕەفە شەل



حاجی حەمەدەمینی ئیلینجاخی



مەحمود سێدەری



سامی مەجید



زیرەک کەمال



سالار بۆگدی



عەلی گەدە



ئەنوەر سوارە



سەلاح چاوشین



سەرداری قالە بەراز



مامۆستا عەلی پەرلەمان



حەمە عەلی بەرزنجی



قادر گۆزێ



عەلی شیعە



بەرزانی قالەی خەڵوز



فاروق جەمار




میدیا حوسێن



بورهان محەمەد



نەجمەدین مەلا



یوسف زۆزانی



محەمەد موکری



مەلا ئەحمەدی گەرمیان



ئـەحـمـەد تـۆفـیـق مـەعـرووف

ناسراو بە (ئەحمەدی دادی )



سالاری سەلمە



بەهادینی حەلیم



بارزان مەلا خالید



خالید جووتیار



سیروانی عەبلی عەبان



شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوو



سمکۆ دزەیی



شەهید رێباز، م.بەکرن شەهید شاخەوان ، سەفینی مەلا قەرە



سەفین مەلا قەرە



نەسرەدین هەورامی



نادر هەرووتی



محەمەد رەنجاو



ئومێدی سەعید گەوهەر



فەتاح کاویانی



حاجی مەحمود گەلاڵی



نەوزاد یەحیا باجگر



حاکم فەرهاد



مەلا ئەحمەدی دسکەرە



ئاوات قارەمانی



فازیل کەریم ئەحمەد



فەرهەنگ گۆمەشینی



ڕێباز، مام ڕۆستەم، مامۆستا بەکر




ملازم عومەر، م.جەعفەر، سالار عەزیز

ئەو راژۆیانە وتەی بەتام ونەستەق وڕاستی ڕووداو وبەسەرهاتن، هەڵقوڵاوی نـاو گریان وئاگردانی شۆڕش وڕۆژانـــی سەخت وسەنگەری خەباتن، مەبەست لێیان هەڵکشان وشکانـــدن نییە بەنیەتی سووکایەتی، بەڵکو دەرخستنیانە وەک سامانێکی نەتەوایەتی وکوردایەتی، چونکە خەندە دەبێتە مەشخەڵی ڕووناکی مرۆڤایەتی، پیاوێک گریا تا دونیا پێ بکەنێت، (چارلی چاپلین) توانی داری غەم هەڵبکەنێت، کەسی بە دۆزەخ نەدەترسانڎ وبەڵێنی بەهەشتی نـەدەدا بەکەس، پەیامبەری شادومانی وپێکەنین بوو بەس، بەجوولە وگۆچان شەپقە، یەک قسەی نەکرد ونەیکرد نەقە!. ئەو گوتی گەورەترین گرنگترین شانازی بەندە، گۆڕینی گریانی خەڵکە بۆ پێکەنین وخەندە!.

# Xandai Xebat

Rahbar Said Braem


KOSHKI SARA
کۆشکی سەرا
کۆشکی سەرا
0750 1593939